سـەمـاح رافع مـحـەمـەد

# ڕێبازە هاوچەرخەکانی فەلسەفە

## تاریق کارێزی

لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی و پەراوێزی بۆ ئامادەکردووە

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**کوردستان/ هەولێر ت (٢٢٢٩٩٩٢)**

- **کتێبی ژمارە:** (٣٧)
- **کتێب: ڕێبازە هاوچەرخەکانی فەلسەفە**
- **نووسینی: سەماح رافع محەمەد**
- **وەرگێڕانی: تاریق کارێزی**
- **چاپی یەکەم: هەولێر – ٢٠٠١**
- **دەرهێنانی هونەری: قاسم قادر**
- **ژمارەی سپاردن (١٣٨)ی ساڵی ٢٠٠١ دراوەتێ.**
- **چاپخانەی خەبات / دهۆک**

ئەم کتێبە وەرگێڕانی کتێبی (المذاهب الفلسفية المعاصرة)یە بەڕێز (سماح رافع محمد) پسپۆر لە وەزارەتی پەروەردەی میسر نووسیویەتی



## پێش دەستی

مەبەست لە فەلسەفەی هاوچەرخ، فەلسەفەی سەدەی بیستەمەو کاکڵەکەی ئەو فەلسەفەیە دەگرێتەوە کە رابەرانی زۆربەی ژیان و گوزەرانیان لەم سەدەیەدا بەسەر بردووەو بیرو بۆچوونەکانیان تێکەڵ بە باس و خواس و گیرو گرفتەکانی ئەم سەدەیە بووەو بە شێوەیەکی کاریگەر دەربارەی گێرمەو کێشەکانی سەردەم بیروڕایان دەربڕیوە.

لە راستیدا کاروانی فەلسەفەی هاوچەرخ لە سەرجەم مێژووی فەلسەفە جودا نییەو زۆربەی باس و خواسەکانی فەلسەفەی هاوچەرخ پێشتر فەلسەفەی کۆن و ناوەڕاست و نوێ باسیان لێوە کردووە، تەنها مەگەر چەند باس و خواسێک نەبێ کە پەیوەستن بە دۆزینەوەو تیۆرییە زانستییە هاوچەرخەکانەوە، خاڵی گرنگ لە فەلسەفەی هاوچەرخ لەوە دایە کە لە رێڕەو و چارەکردنی بابەتە جوداجوداکانیدا، تازەو هاوچەرخە.

لە سووکە چاو خشاندنێک بە کاروانی بیرو فەلسەفەدا تێدەگەین کە هەر لە کۆنەوە بابەتەکانی بیرو ئەندێشەو فەلسەفە بەسەر کراونەتەوە، باسەکانی گیان و نەمری و پەیوەندیی بەندە بە خوداوەندەکان و هێزە نادیارو شاراوەکان و مەسەلەی ویژدان و پەیوەندیی نێوان مرۆڤان و ئاکار لەلای هزرڤانانی رۆژهەڵاتی دێریندا بەسەر کراونەتەوە. باسەکانی سروشت و بابەتەکانی ئاوەز (عەقڵ)و





دەروونناسیش لەلایەن فەیلەسووفانی گریک و رۆمانەوە باسیان لێوە کراوەو، بە هۆکارەکانی سروشت و شیتەڵ کردنی هاتنە کایەی دیاردە ماددییەکان لەپاڵ شیکردنەوەی عەقڵی مرۆڤ و بنچینە سەرەکییەکانی ئەو عەقڵەو جۆری ئیدراک و هەست بە شتان کردن و جوانی و جوانناسیش باسیان لێوە کراوە، بێ لە باسکردنی نەفسی مرۆڤ و پەیوەندیی ئەو نەفسە لەگەڵ بەدەنی مرۆڤ و پەیوەندیی لەگەڵ عەقڵ و سروشتی دەرەکیدا.

لە سەدە ناوەنجییەکانیشدا فەیلەسووفانی ئیسلام و دیان لە بابەتە ئایینی و رۆحییەکانیان کۆڵییەوەو بە درێژی باسی سروشتی خودای مەزن و سیفاتەکانی و راست و دروستی پەیامبەری و بنەمای باوەڕو زانستی سۆفیگەری و جۆرەها بابەتی ئایینی دیکەیان کردووە.

گەرچی فەیلەسووفانی چاخەکانی پێش ئەم چاخە شتێکیان نەهێشتووە کە باسی لێوە نەکەن و بە دەروازەی هەموو باسێکدا وەژوور کەوتوون، وەلێ فەلسەفەکاری کۆششێکی دەرگا هەمیشە والآیەو هەردەم نەشونماو پەرەسەندن وەخۆوە دەگرێت، لەبەر ئەوە فەیلەسووفە هاوچەرخەکان بە پشت بەستن بە دۆزراوە زانستییە تازەکان کە لە ئاکامی رێڕەوی ئەزموونکارییەوە زانست ئاشکرای کردن، توانییان فەلسەفەی زانستیی نوێ دەربارەی شوێن و کات و هۆداری و جوولەو هەربوو (الحتمیة)وە بدۆزنەوەو دووبارە بابەتە نەمرو هەمیشەییەکانی فەلسەفەیان بە شێوازو رێڕەوێکی تازە داڕشتەوە.

# رووداوە بزوێنەرەکان لە فەلسەفەی هاوچەرخدا

لەبەر ئەوەی فەلسەفە وابەستەی ژیانی سەردەمەکەی خۆیەتی و کارەسات و رووداوە سروشتی و ژیانییەکان کار لە رەوت و کاروانەکەی دەکەن، بەم پێ و خواستە دەبێ چەند رووداوێک هەبن کاریان لە رەوتی بەرەو پێش چوونی فەلسەفە کرد بێت و بووبێتە هۆی سەرهەڵدانی رێبازە جودا جوداکانی فەلسەفەو وایان لە فەیلەسووفەکانی سەردەم کرد بێت، کە رێچکەو رێبازی نوێ دابڕێژن بۆ فەلسەفەکانیان لە مەیان چارەسەر کردنی ئەو بارە کۆمەڵایەتییە نوێیەی لە ئاکامی گۆڕانکارییە مەزنەکانی کە بەسەر ژیانی مرۆڤدا هات، وەکو ئاکامێکی بێ مەفەڕی باڵا دەستیی زانست و رێچکەی زانستی تاقیکاری و ئەزموون و دیسان بەرپابوونی کارەساتە دڵتەزێنەکانی دوو شەڕە مەزنەکەی جیهان لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا، ئەمانەش گرنگترین ئەو رووداوانەن:

أ- ئەو کودەتایەی بەسەر زانستی فیزیای کۆن و سروشتناسیی کۆندا





کرا، تیۆرییەکانی نیووتنی لە بنج و بنەوانەوە راتەکاندو هزرو فەلسەفە لە کۆت و سنووری بیری نیووتنیزمی (النیوتنیة) دەرباز بوو، ئەویش کاتێک بوو کە ئینشتاین تیۆری رێژەیی (النسبیة) ئاشکرا کردو تیۆرییەکانی نیووتنی لە ئامێز گرت و، نەک هەر خولانەوەی زەویی شیکردەوە، بەڵکو تەواوی تەنەکانی گەردوون و خول خواردنی ئەو تەنانەی شیکردەوەو، هاوکاتی ئەویش ئەندازەی نائیقلیدیی (الهندسة اللا اقلیدیة) دۆزرایەوە، کە ئیقلیدیسی زانای گریک ئەندازەی لەسەر بناخەی رێکی و رێک ئەندازی (استواء) دامەزراند بوو، کەچی ئینشتاین لەسەر بناخەی چەمانەوەو جوولەو بزووتنی راڤە کرد، بەمە چەمکی (رەها) رەت کرایەوەو میکانیزمییش بەرپەچ درایەوەو سەرپێچی لە هەربوویایەتی (الحتمیة)یش کرا. واتە ئەو کودەتاو شۆڕشەی سروشتناسیی گرتەوە هاوشانی ئەوە فەلسەفەی هاوچەرخیش شۆڕشێکی بەخۆوە دیت، ئەویش لەبەر لێک جودا نەبوونەوەی بیری زانستی و هزرەوەری و فەلسەفە.

ب- ئەو پێشکەوتنە زانستی و ماددییە مەزنەی کە زانستە سروشتییەکان بە هۆی رێبازی ئەزموونکارییەوە بە دەستیان هێنا، هۆیەکی دیکەیە بۆ ئەو گۆڕانکارییەی فەلسەفەی گرتەوەو بە تەواوی لە پشکنین و لێکۆڵینەوەکاندا پشت بە زانست و ئەزموونکاری بەستراو وای لێ چاوەڕوان کرا کە ئەوپەڕی دەستکەوت بە جوانترین شێوە لە ماوەیەکی کورتدا لە رێی رێبازی

ئەزمـــوونکارییـــەوە بە دەست بێت، ئەمـــەش نەک هەر زانســـتـە سروشتییـەکانی گرتەوە بەڵکو زانسـتـە مرۆڤـایەتییـەکـانیـشی گرتەوەو، هەمـوو جوولەو بزووتـن و رووداوێکی دنیـای مـرۆڤ بۆ دیاردەو گـۆڕانکـاریی مـاددی گـێـڕدرایەوەو، وای بۆ دەچوون کـە هەمـــوو پەیوەست بە گـــۆڕانکاریی مـــاددین و هەمـــوو گۆڕانکارییەکیش بە ئەزموون و ئەزموونکاری دێتە ژێر دەسەڵات و پێوانەو، پاشـان پەرەپێـدان و بەرەو پێش بردنی ئەستەم نابێت، هەموو ئا ئەم شتانە وایان کرد کە ڕێڕەوی فەلسەفەی زانستیانە سەر هەڵبدات و وایان کرد گەلێ ڕێبازی ریالیزمی لە فەلسەفەی هاوچەرخدا سەر هەڵبدات.

ج- سێیەم کارێک کە لە بەرەو پێش بردنی ژیاری ئەم چەرخەو بیری هاوچەرخدا کاری کرد بێت، متمانە کردن بوو بە بیرکاری (ماتماتیک)، چونکە گەڕانەوە بۆ شیکردنەوەی ماتماتیکانە، وردی و ڕەوانیی لە دەربڕیندا دەردەخست، گەرچی پێشینانیش گرنگیی ماتماتیکیان زانی بوو، بەڵام فراوانیی ئەم زانستەیان نەزانی بوو، بەڵکو هەر پەیوەست بوون بە ڕێک ئەندازی، واتە ئەندازەی ئاسۆیی (الهندسة المستوية)کەی ئیقلیدس کە نیووتن سروشتناسییە کلاسیکییەکەی خۆی لەسەر دامەزراند بوو، کاتێکیش ئەو ئەندازەیە کودەتای بەسەردا کرا بە هۆی ئەندازەی هێڵی چەماوەوە، ئینشتاین سروشتناسیی تازەی لەسەر دامەزراند.





ئەم شتانە وایان لە زانایانی لۆژیکی وێنەیی (المنطق الصوري) کرد هەوڵی لێکدان و گرێدانی بەرفراوانیی شیتەڵی ماتماتیکانەو، وردی لە لۆژیکی کۆندا(المنطق القديم)بدەن لە شێوەی زانستێکی نوێ بە ناوی (لۆژیکی ماتماتیکی) یان (لۆژیکی هێمایی) (المنطق الرياضي أو الرمزي) بدەن.

هەموو ئەم شتانە لە نێو فەلسەفەی هاوچەرخدا ڕەنگیان دایەوە بەوەی کە فەلسەفەی هاوچەرخ شێوازی شیتەڵ کردنی ماتماتیکانەی گرتەبەر.

د- دیسان لە رووداوە گرنگەکانی ئەم چەرخە کە لە شێوەی کاردانەوەیەکی رۆحی و گیانی بوو دژ بە سیمای ماددییانەی ژیاری ئەم سەردەمەی رۆژاواو، هەرەس هێنانی بەهای بوونی مرۆڤ وەکو ئافەریدەیەکی زیندوو و بوونی بە شتێک لە شتان. ئەمەش نالەبارو ناشی بوو سەبارەت بە پێکهات و بوونی زیندووی مرۆڤ، بەوەی مرۆڤ بریتییە لە ملیۆنان خانەی زیندوو و جۆرەها گۆڕانی بایۆلۆژیی ماددییانە بە خۆیەوە دەبینێ و، هەمیشە لە پەرەسەندنی گیانییش دایە.

ئەوەی کە سەرنج ڕاکێشە ئەم پەرچدانەوەو کاردانەوە رۆحییە لە شێوەیەکی ڕێک و پوختدا نەهات، بەڵکو زیاتر بە شێوەیەکی ئاسایی هاتە دەست و بووە هۆی سەرهەڵدانی چەندین فەلسەفەی نوێ بۆ ژیان و ڕێبازگەی رۆحییانەی هاوچەرخ.

هـ- شـیکردنەوەی عـەقـڵی مـرۆڤ لەلایەن سـیگمـۆند فـرۆیدەوە[*] دەروازەیەکی تازەی واڵا کـردەوە بۆ بیـری مـرۆڤ و، بە یەکـاڵا کـردنەوەو ئاشکرا کـردنی هەسـتی نائاگـا (نەست) (اللاشـعـور)و تواناکـانی کـارکـردنی نەست لە ژیانی مـرۆڤ و رەوتی ژیانەکەی، چونکە پێشـتـر هەروا باو بوو، کـە هەمـوو مـرۆڤـێک بە پێی بڕیارەکـانی عـەقڵ بەڕێوە دەچێت و هەر عـەقڵ قـەڵەمڕەوی حـوکم کردنە بەسەر مرۆڤدا، بەڵام فرۆید ئاشکرای کرد کەوا نەست گەلێ لە هەست بەهێـزترەو پاڵنەرێکی کـاریگەری دوژمنکاریانەیە لە ژیانی مرۆڤداو بەشێکی زۆری هەڵسوکەوت و ئاکارەکانی مرۆڤ لە دنیای نەستەوە بەڕێوە دەچێت.

ئەم دۆزینەوەیەی فـرۆید بووە هۆی ئەوەی گەلێ فەیلەسووف بەرەو ناخی مرۆڤ بچنەوەو بە تێڕوانینێکی ریالیستانە واقیعی حاڵی شی بکەنەوە.

---

[*] سیگمۆند فرۆید (فروید – Freud) / (١٨٥٦-١٩٣٩) پزیشکێکی نەمسایی بوو، دامەزرێنەری شیتەڵ دەروونناسییە، لێکۆڵینەوەی لە دنیای نەستدا کردووەو تێزی تایبەتی لە بارەی هۆکارو پاڵنەرەکانی نەست و سێکسی هەیە.







## مارکسیزم (الماركسية – Marxism)

مارکسیزم لە ناوی یەکەم فەیلەسووفی ئەم رێبازە (کارڵ مارکس)ەوە هاتووە، کە بە دووقۆڵی لەگەڵ (فریدریک ئینگلز)ی هاوڕێ و هاوبیری تەمەنی، بناغەکەیان دانا، بناغەی ئەم فەلسەفەیە لەسەر هێرش کردنە سەر رژێمی سەرمایەداری دامەزراوە، ئەو رژێمەی تێیدا بورژوا دەسترۆیشتووەکان دەستیان بەسەر هۆیەکانی بەرهەم هێناندا گرتووە، هەزاران هەزار کرێکاری هەژارو دەستکورت لە ژێر باری ستەمیاندا دەچەوسێتەوە.

هەڵبەت نارێکیی مەسەلەکە لەوە دایە، کرێکاران دەبنە بەشێک لە هۆیەکانی بەرهەم هێنان و رەنجی بەرهەم ئەوان دەیدەن، کەچی بەپێی یاسای زێدەبایی، رێژەیەکی بەروبوومی رەنجی کرێکار دەچێتە گیرفانی خاوەن هۆیەکانی بەرهەم هێنانەوە، بەم شێوەیە خاوەن کارگە لە هەموو هەشت سەعات کارکردنی هەر کرێکارە، بەرهەمی چەند سەعاتێک بێ ماندووبوون دەچێتە گیرفانییەوە، ئەویش سەبارەت بە موڵکدارێتیی هۆیەکانی بەرهەم هێنانە.



جا بۆیە مارکسیزم لەم خاڵەوە بەرەو دارشتنی بناغەی داد دەچێت ئەویش بە رەشکردنەوەی موڵکدارێتی لە کۆمەڵداو، هەموو کەسێک دەبێ هەموو شتێکی هەبێت، لە هەمان کاتدا کەسیش خاوەنی هیچ شتێک نابێت بە دیاری کردن و دەست نیشان کردن، چونکە ئەوە تەنیا هۆیەکە بۆ بنبڕ کردنی بونیادە چینایەتییەکان، بەوەی کاتێک کۆمەڵ لە چەند چینێک پێک دێت، تێیاندا دوو چین زۆر ئاشکراو دیار دەبن، چینی سەرمایەدارانی خودان هۆیەکانی بەرهەم هێنان و چینی کرێکارانی دروستکەری بەرهەم، چینی یەکەمیان سەرمایەدارانەو، چینی دووەمی کرێکاران دەچەوسێنێتەوە، چونکە بەپێی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووریی کۆمەڵگای سەرمایەداری، هەموو سەرمایەدارێک بە پەنجەیەکی نادیار بەشێکی رەنجی هەموو کرێکارێک دەدزێ و گیرفانی خۆی پێ پڕ دەکات.

کەواتە موڵکداری و چینایەتی دوو رەگەزی دەردەداری کۆمەڵن لە روانگەی ماکسیزمەوە، جا بۆ دروست کردنی کۆمەڵگایەکی پڕ دادو بەختەوەر دەبێ ئەو دوو دیاردەیە قەڵاچۆ بکرێن، بە وەرگرتنی دەسەڵات لە لایەن کرێکارانەوەو پاشان دروستبوونی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا، وردە وردە کۆمەڵگای سۆشیال دروست دەبێت وەکو هەنگاوێکی بنچینەیی بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگای کۆمۆنایەتی (المجتمع المشاعي)، کە تێیدا خەڵکی لە کۆتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان رزگاریان دەبێت.





مارکس بناغەی مارکسیزمی لەسەر دیالیکتیکی هیگلی[*] و ماتریالیزمەکەی فیۆرباخ[**] دامەزراندوە، لە هەردووکیانەوە ماتریالیزمی دیالیکتیکی دامەزراند، بە هۆی ئەو و ماتریالیزمی مێژوویی ژیانی شیکردەوە، چونکە مادده یەکەم راستیی ژیانەو هەموو شتێک لەوەوە دروست دەبێت و دەرسکێت، دیالیکتیکیش ئەوە دەسەلمێنێ کە هەموو رژێمێکی نوێ لە مندالّدانی رژێمەکەی پێش خۆیەوە دروست دەبێت و بەرە بەرە نەشونما دەکات تا زالّ دەبێت بە سەریداو لە کۆتاییدا رژێمە کۆنەکە بە جارێ خاپوور دەکات، بەم شێوەیە رژێم دوای رژێم دروست دەبێت تا دەگاتە دادیاریی کۆمۆنیزم و لەو کۆمەڵەدا مرۆڤ دەگاتە تەواوی دادیاری. ماتریالیزمی مێژووییش رەوتی مێژوو و گۆڕانکارییە سەرەکییەکانی، بە گۆڕانی هۆیەکانی بەرهەمهێنان دەبەستێتەوە کە سەرجەم مێژووی رەوتی مرۆڤایەتی شیدەکاتەوە.

مارکسیزم کەوتە ژێر کارلێکردنی فەلسەفەی ماتریالیزمی ئەڵمانی کە لە سەردەمی ئەودا باو بوو، وەکو وتمان دیالیکتیکیشی لە هیگلەوە وەرگرت، لە پاش ئەوە بارودۆخەکەی لە روانگەی خۆیەوە چاک کرد. هیگل لە بیرۆکەوە دەستی پێ دەکردو واقیعی ماددیی

---

(*) فریدریک هیگل (هیغل - Hegel/ ١٧٧٠-١٨٣١) فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە، لەلای ئەو هزرو بوون یەک شتن کە بیرۆکەیە، بیرۆکەش قۆناغ قۆناغ پەرە دەسێنێت، سەلماندن ئنجا رەتکردنەوەو پاشان پوختە.

(**) لۆدڤیگ فیۆرباخ (فویر باغ - Feuerbach/ ١٨٠٤-١٨٧٢) فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە، لە ئایدیالیزمییەکەی هیگل دابڕاو، لە پێگەی رەخنەگرتن لە بیرۆکەی خوداو ئایین، تیۆری ماتریالیزمی دانا.



دەکردە بەرهەم و ئاکامی ئەو بیرۆکەیە، دیالیکتیکی مارکسیش لە واقیعی ماددییەوە دەست پێدەکات و بیرۆکە دەبێتە ئاکامی واقیعە ماددییەکە. ئەمەش مارکسیان بەرەو باوەڕ کردن بە ماتریالیزمی دیالیکتیک بۆ راڤە کردنی هەموو راستییەکان، بە بوون و سروشت و مرۆڤەوە، برد، چونکە مادده راستییە تەنیاکەی گێتییە، لە رێی قۆناغە دیالیکتیکەکانەوە هەموو جۆرەکانی بوونی لێ هاتەکایەوە، ئەم قسەیە مرۆڤ و کۆمەڵیش دەگرێتەوە، هەموویان رەنگدانەوەی ماددەن و بەرەو ئەو دەچنەوەو دیالیکتیکیش لەوەوە دەست پێدەکات، چونکە مادده پێش بیرۆکەیەو بنچینەی بوونی بیرۆکەشە.

مارکس لە فەلسەفەکەیدا سوودی لە ئابووریی رامیاریی بەریتانیای دوای شۆڕشی پیشەسازی وەرگرتووە، بنچینەی ئابووریی رامیارییش ئادەم سمیس و داڤید رێکاردۆ بناغەکەیان داناو یەکەم کەسانێکیش بوون تیۆری بەهای کاریان دانا، بەبێ ئەوەی تەواوی بکەن، تا ئەوەی سەرمایەدارەکان بە چەوتی راڤەیان کردو ئامانجی ئابووری لای ئەوان بووە ئیش کردن بە کرێکاران بۆ دروست کردنی کەل وپەل بەرانبەر بە کرێیەکی کەم، کە ناگاتە ئەرکی ماندوو بوونی کرێکاران، لەو کاتەی خاوەن سەرمایە هەموو بەروبوومی کارەکەی بۆ خۆی دەبات، مارکس ئەم راڤە کردنە مەبەستدارەی رەت کردەوە، بڕیاری دا کە بەهای بەرهەم لە کاردا پەیوەست بە کاتی پێویست بۆ بەرهەم هێنانی و بە پێویستییە بنچینەییەکانی ژیانی کرێکارەوە. لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا لەو کاتەی کرێکار دوازدە





سەعات کار دەکات، کەچی بەهای شەش سەعات کارکردن وەردەگرێت، بەهای شەش سەعات کارکردنەکەی دیکە تەنیا دەچێتە گیرفانی سەرمایەدارەکەوە، بە کەڵەکە بوونی سەرمایەش لە لای چەند کەسانێک، جیاوازییە چینایەتییەکەی نێوان ئەوان و کرێکاران فرەتر دەبێت، لەبەر ئەوە پێویست وایە کارگەو زەوی و هەموو هۆیەکی دیکەی بەرهەم هێنان ببێتە موڵکی ئەو کەسانەی کاری تێدا دەکەن، بۆ ئەوەی هەموو قازانج و زێدەکە بۆ گیرفانی خۆیان بگەڕێتەوە، کە پاشتر دەبێتە هۆی نەمانی جیاوازییە چینایەتییەکان.

ڕێبازە سۆشیالیزمەکانی فەرەنسا سێیەم چاوگی دروست بوونی مارکسیزم بوون، (سان سیمۆن)[*] و (فۆریێ)ی[**] فەرەنسی داوای دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی سۆشیالیزمی نموونەیی و تەواو و تۆکمەیان دەکرد، کە دوور بێت لە زەفتکاریی سەرمایەداران و ژیانێکی خۆشنوودیش بۆ کەسانی کۆمەڵ مسۆگەر بکات و، هیچ جیاوازییەکی چینایەتیشی تێدا نەمێنێت. بەڵام جێی داخە کە لە هزرو بیرکردنەوەیاندا گەلێ پەرگیر (متطرف) بوون، نەیانزانی چۆن سۆشیالیزمەکەیان جێبەجێ بکەن، چونکە سۆشیالیزمێکی خەیاڵی

(*) سان سیمۆن (سیمون – Simon/ ١٧٦٠–١٨٢٥) تۆپاوی و سۆسیالیستێکی فەرەنسییە، لە گەڵاڵە کردنی هزری ماتریالیستانی فەرەنسیدا بەشداربوو، دژ بە ڕێوڕەسمە ئایدیاییەکان بوو، بە تایبەتی ئایدیالیستی ئەڵمانی.

(**) شارڵ فۆریێ (فوریە – Fourier/ ١٧٧٢–١٨٣٧) فەیلەسووف و ئابووریناسێکی فەرەنسییە، بانگەشەی بۆ چاکسازیی ئابووریی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤانە دەکرد، لە ڕێی دامەزراندنی کۆمەڵەی بچووک بچووکی کرێکاران، کە کۆمەڵگایەکی هەرەوەزو بەرهەمهێن و تەواو گونجاو دروست بکەن.





بوو. کاتێک کە مارکس هات، توانی و بۆی لوا ئەو سۆشیالیزمە لە سۆشیالیزمێکی خەیاڵییەوە بهێنێتە سەر فۆرم و ناوەڕۆکی زانستی، ئەوەشی دەست نیشان کرد کە چۆن لە ژیاندا جێبەجێ دەکرێت، بە یەکگرتنی هێزەکانی چینی کرێکاران لە کۆمەڵگاو پاشان داماڵینی موڵکدارێتیی هۆیەکانی بەرهەمهێنان لە سەرمایەدارە زەوتکەرەکانی بۆ ئەوەی دووبارە لە بۆ گەلی بگێڕنەوە.

لەو کاتەشدا چینی کرێکاران دەسەڵات دەگرێتە دەست و لە قۆناغی گۆڕانکارییەکەدا چینی کرێکاران دیکتاتۆریەتێکی کاتی دەنوێنێ، لەو مەیانەدا خۆشنوودیی هەموو ئەندامانی کۆمەڵ بەجێ دێت، کۆمەڵگا نموونەییەکەی سۆشیالیزم دەبێتە ڕاستییەکی بەر دەست و دیکتاتۆریەتی پڕۆلیتاریا ئاوا و سەرنگون دەبێت.

ئەمەیە پێکهاتە بنچینەییەکانی مارکسیزم کە هەموو بوارەکانی فەلسەفەو ئابووری و رامیاری و کۆمەڵناسی دەگرێتەوە، بێگومان مارکسیزم لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئەورووپا پەیدا بوو و گەشەی سەند، پاشتر کاری لە هزرەوەرو فەیلەسووفی رووس ڤلادیمیر لینین[*] کردو، ئەم فەلسەفەیەی لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەری (١٩١٧) لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا پیادە کرد، لینین لە پەرەپێدانی مارکسیزمدا دەستی هەبوو، کار گەیشتە ئەو ئاستەی مارکسیزم بووە ڕێڕەوێکی جیهانی و گەلێ فەیلەسووفی تایبەت بەم ڕێڕەوە لە

(*) لینین (لینین – Lenine/ ١٨٧٠–١٩٢٤) سەرکردەی شۆڕشی رووسیاو دامەزرێنەری پارتی کۆمۆنیستە لە رووسیای سۆڤیەتیدا.

سەرانسەری جیهاندا سەریان هەڵدا، بەشی زۆریان هەر لەسەر ڕێچکەی مارکس و ئینگلز و(*) لینین دەڕۆن و بۆ هەمان ئامانج و مەبەست کۆشش دەکەن.

## پوختەی بیروڕاکانی لینین

ماتریالیزمەکەی مارکس و ئینگلز بە دۆزراوە تازەکانی بواری زانست لە چاخەکەی خۆیاندا بەسترا بووەوە، کە هەر هەموویان وەکو سەلماندن بوون بۆ ماتریالیزم، بەناوبانگترین ئەو دۆزراوانە: دۆزینەوەی خانەی زیندوو، دۆزینەوەی ئاڵوگۆڕ بوونی وزە، پاشانیش دۆزینەوەی تیۆری پەرەسەندن، ئینگلز هەوڵی سەلماندنی دیالیکتیکەکەی هیگلی دەدا بە پیادەکردنی لەو دۆزراوە زانستییە تازانەی کە لە زەمانی هیگلدا پەیدا نەبوو بوون، کە دۆزینەوەیان لە سەردەمی ئینگلز وەکو بەڵگەیەک وا بوون لەسەر راستیی دیالیکتیکی هیگل، ئەویش کاتێک بەسەر سروشتدا جێبەجێ دەکران، ئەم دۆزراوانە یارمەتیی جێبەجێ کردنی ڕێڕەوە کۆنەکەی ماتریالیزمیشیان دا.

بەڵام کاتێک لینین هات، دۆزینەوەی دیکەی نوێی تایبەت لە سروشتناسیدا سەری هەڵدا، وای لە هەندێ فەیلەسووف کرد لە جیاتی ڕێبازی ماتریالیست بەرەو ڕێبازی ئایدیالیست بچن بۆ

(*) ئینگلز (انغلز – Engels / ١٨٢٠–١٨٩٥) سۆسیالیست و فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە، لەگەڵ مارکس دا لە ١٨٤٨مانفێستی شیوعییان دانا.





شیکردنەوەی سروشت. ئەو دۆزراوە تازانە بریتی بوون لە سەرەتاکانی دۆزینەوەی ئەتۆم و پێکهاتەکانی و گێڕانەوەی مادده بۆ وزەو گەلێ دۆزراوەی دیکە، وایان لە فەیلەسووفان و بڕێکی زانایانی هاوچەرخی لینین کرد، بڕیاری ئەوە بدەن کە کاتێک مادده لێک دەکرێتەوە نابێتەوە مادده، بەڵکو دەبێتە نامادده.

لە ئاکامدا ئەوان فەیلەسووف و زانا لە ماتریالیزمەوە بەرەو جۆرە ئایدیالستێک چوون، جا لینین هەوڵێکی تازەی دا- چەشنی هەوڵە پێشینەکەی ئینگلز- بۆ دووپات کردنەوەی بوونی مادده، بەڵام بەپێی واتا تازەکەی، هەروەها لە ڕێی ئەو دۆزراوانەوە ویستی رادەی راستیی ڕێڕەوی دیالیکتیکی هیگل بسەلمێنێ.

سەرەتا لینین دەستی دایە ڕەخنەگرتن لە ماتریالیزمە باوەکەی لای فەیلەسووف و زانایانی سەدەی نۆزدەهەم و رایگەیاند، کەوا ماتریالیزمەکەیان ماتریالیزمێکی میکانیکییەو لە دۆزراوە نوێیەکانی سەردەم وەدوا کەوتووە، هەروەها ماتریالیزمێکی وشک و نادیالیکتیکە، حیسابی بۆ پەرەسەندنە یەکگرتووەکە نەکردووە، هەروەها ماتریالیزمێکی پووچەو دەرکی بە گەوهەری مرۆڤ و پەیوەندییە ناوەکییەکانی مرۆڤ نەکردووە، لەبەر ئەوە ماتریالیزمە کۆنەکە ماتریالیزمێکی وشک هەڵاتووە، تەنها راڤەی جیهانی دەکرد دوور لە توانای گۆڕینی ئەو جیهانە، کە ماتریالیزمی راستەقینە ماتریالیزمێکی دیالیکتیکیی پەرەسەندووە، ئا ئەمە بوو، زاناو فەیلەسووفە هاوچەرخەکانی لینین لێی بێ ئاگا بوون، دۆزراوە

تازەکانی زانست سەرسامی کردن و بڕیاری ئەوەیان دا کە ماددە نییەو بەمە بەرەو جۆرە ئایدیالیستییەک چوون.

لینینیش رایگەیاند کەوا ئەو دۆزراوە تازانەی رادیۆمی تیشکدەرو ئەتۆم و شتەکانی دیکەی لەم چەشنە، هەر هەموو خۆیان لە بواری رێڕەوی دیالیکتیکی ماتریالیزم دووپات دەکەنەوەو دەیسەلمێنن، بەوەی بزووتنی ماددەو پەرەسەندنی، تاکە راستەقینەی دووره گومانە، بەڵام باس کردنی ماددە بەوەی کە نەبزواو و چەسپاوە پێچەوانەی رێڕەوی دیالیکتیکە.

جا لینین داوای لە فەیلەسووف و زانایانی مارکسیزم کرد کە شیکردنەوەی رێڕەوی دیالیکتیکی، شیکردنەوەیەکی ماتریالیزمانەیە، شتێکی گەلێ پێویستەو لەگەڵ سروشتی هەمیشە پەرەسەندوو یەک دەگرێتەوە، چونکە ئا ئەمەیە راستیی گەوهەری مارکسیزم کە چەمکی (ماتریالیزمی دیالیکتیک) دووپات دەکاتەوە، کاتێک ماددەو دیالیکتیک لە یەکەیەکی پتەودا ئاوێتەی یەک دەبن، لە توانادا دەبێت لە مەیانی ئەمەوە گێتی و مرۆڤ پێکڕا لە هەموو حاڵەتەکانی گۆڕان و پەرەسەندن، هەرچەندی ئاڵۆزیش بن، راڤە بکرێن.

بەم شێوەیە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لینین چاکترین نوێنەری فەلسەفە ماتریالیزمەکەی مارکسیزم بوو بە رێڕەوە دیالیکتیکییەکەی کە رۆحی سەردەمی پێ دەردەبڕی و لەگەڵ تازەترین پەرەسەندن و ئاکامەکانی زانست بەرێوە دەچوو، تا بەوانەی دوای مردنیشی پەیدا بوون.







# پراگماتیزم
## سروشتی پراگماتیزم و بارودۆخی سەرهەڵدانی

پراگماتیزم فەلسەفەیەکی زانستییە و لە کرۆکی ماتریالیزمەکەی سەدەی بیستەمدا سەری هەڵدا. پراگماتیزم بە رەوت سەرمایەدارەو لە ئەمەریکادا پەیدا بووە، بە پەرەسەندنی رێڕەوەکانی پشکنینی زانستی و روانینە ریالیزمەکانی هاوچەرخەوە بەند بوو.

هەروەها لە بەکارهێنانی شێوازی زانستی و پشت بە ماددەو واقیع بەستنەوە، چەشنی مارکسیزم، درێژە بە رەوتی خۆی دەدات، بەڵام لە تێڕوانینی کۆمەڵایەتی و رامیاری و ئابووری لە گەوهەردا لێی جوێ دەبێتەوە، چونکە ئەمەیان فەلسەفەی کۆمەڵگەی سەرمایەدارە بە پێچەوانەی مارکسیزم کە فەلسەفەی کۆمەڵگای سۆشیالیزمە.

وشەی (پراگماتیزم)یش لە رووی زمانەوانییەوە لە وشەیەکی یۆنانییەوە هاتووە، واتای کاری سوود بەخش یا ئیش کردنی بەسوود دەبەخشێ، ئەوسا مەبەست لە پراگماتیزم ئەوەیە، (رێبازی کردارەکی) یا (رێبازی سوودخوازی).





پراگماتیزم لە کێشەی نێوان ریالیزم(*) و ئایدیالیستدا(**)، دژایەتی رێبازە ئایدیالییەکان دەکات، هەروەها کێشەی پێش بوون و پاش بوونی بیرو واقیع رەت دەکاتەوە، چونکە فەیلەسووفانی ئەم رێبازە گەرەکیانە تیۆری زانین ببێتە ئامرازێکی کارکردن و هۆیەک بۆ سوود لە واقیع وەرگرتن و دەست بەسەردا گرتنی، نەک بەرپا کردنی ناکۆکی دەربارەی کێشەکانی، لەبەر ئەوە پراگماتیزم رێڕەوێکی زانستییە زیاتر لەوەی کە فەلسەفەیەکی میتافیزیکی(***) بێت.

هەروەها شێوازێکی کارکردن و فەرمان بەجێ گەیاندنە نەک بەرنامەیەکی رووتی عەقڵی، جا نرخی بیروڕاکان لە خودو سروشتی خۆیان ترازاوەو چووەتە قاڵبی ئەو ئاکامە کردارەکییانەی لێیان دەکەوێتەوە، هەروەها راستەقینە (الحقیقة) بە رادەی گونجاویی لە هۆش ئاوەزماندا بەند نییە- وەکو کە ئایدیالیستەکان بۆی دەچن - دیسان بە رادەی جووت بوونیشی نییە لەگەڵ واقیعدا- وەکو کە ریالیستەکان دەڵێن- بەڵکو راستەقینەی بیرۆکە بەوە دەردەکەوێ کە تا چ رادەیەک بەرەو هەوڵی کردارەکیمان دەبات، هەروەها بە رادەی ئەو سوودەی پێمانی دەگەیەنێت.

(*) ریالیم (الواقعیە - Realism) رێبازێکی فرە رەهەندی فەلسەفییە، باوەڕی بە راستییەکانی دەرەوەی زەین هەیەو بەرامبەر بە ئایدیالیستە.
(**) ئایدیالیست (المثالیە - Idealism) یا ئایدیالیزم/ رێبازێکە هەموو بوونێک بۆ هزر - بە واتا فراوانەکەی - دەگێڕێتەوە.
(***) میتافیزیک (ما وراء الطبیعە - Metaphysicss) لقێکە لە لقەکانی فەلسەفە، واتاکەی بەپێی سەردەم گۆڕاوە، بە تایبەتی لە رووی پەیوەست بوونی بە گرفتی بوون یا تیۆری زانینەوە.

پراگماتیزم وەکو ڕێبازێکی کردارەکیی سوودگەیێن لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا سەری هەڵدا، بە بەکارهێنانی شێوازی کردارەکی بووە مایەی سوودگەیاندنی کردارەکیانەو پێشکەوتنی پیشەسازیانە، بەهۆی توانای مرۆڤ لە تێگەیشتنی سروشت و دەست بەسەرا گرتنی و سوود لێوەرگرتنی، کە بووە هۆی پێش خستنی پیشەسازی، هەموو ئەمانە بوونە هۆی سەرهەڵدان و نەشونما کردنی ئەم ڕێبازە، بێ لەوەی پراگماتیزم زەمینیەیەکی چاکی لە ڕژێمی ئەمەریکای سەرمایەداردا بەدی کرد بۆ نەشونما کردن و بڵاوبوونەوە. چونکە سەرمایەداری بە گشتی لەسەر باوەڕی ململانێ (مبدأ المنافسە)ی سەربەستانەی تاکە کەس دامەزراوە، کاری سوود بەخشی بەرهەم هێنانیشی پێوە بەندە.

هەروەها ئەم ڕژێمە سەرمایەدارە ڕەوتی خەڵکی ئەمەریکای - نەک بۆ خود تێگەیشتنی واقیع یا خۆ خستنە نێو باسی ڕادەی پێش و پاش کەوتنی هزر لەگەڵ واقیعدا- بەڵکو بەرەو تێگەیشتنی واقیع لە پێناو چەپاو (استغلال) کردن و دەست بەسەردا گرتنی، ئەویش بە گەڕان بەدوای ئەو سوودانەی کە بە هۆیەوە پێمان دەگات.

لەبەر ئەوە دەبینین دامەزرێنەرانی ئەم ڕێبازەو زۆربەی فەیلەسوفەکانی خەڵکی ئەمەریکان، پاشتر هزرو بیریان لە هەموو جیهاندا بڵاو بووەوەو، گەلێ فەیلەسووفیش لە دەرەوەی ئەمەریکا پەیڕەویان کردن. یەکەم دامەزرێنەری ئەم ڕێبازە (پێرس)ی[*] فەیلەسووفی ئەمەریکی بوو، کە هەر تەنها بیرۆکە سەرەتاییەکانی ئەم

(*) چارلس ساندرز پێرس (بیرس/ ١٨٣٩-١٩١٤) نووسینە فەلسەفییەکانی لە پاش مەرگی بە (٨) بەرگ بڵاوکرانەوە.





ڕێبازەی داناو بڕیاری دا، کە هەموو بیرۆکەیەک هەر دەبێ ڕێ خۆش کردن بێت بۆ کارێک لە کاران.

دوای ئەویش (ولیەم جیمس)[*] هات و بەرنامەی ڕێبازەکەی دارشت و گوتی کارو سوود پێکڕا پێوەری ڕاستیی بیرۆکەو بەڵگەی ڕاستی و دروستیی ئەون، دواتریش (جۆن دیوی)[**] هات بۆ ئەوەی بە تەواوی بەرنامەی ڕێبازەکە ئاشکرا بکات و دووپاتی ئەوەی کردەوە، کە ئاوەز (عەقڵ) ئامرازی کارو هۆکاری سوودە.

## دامەزراندنی پراگماتیزم لە لایەن پێرس و قوتابییەکانییەوە

یەکەم دامەزرێنەری پراگماتیزم (چارلس پێرس)ە، (١٨٣٩-١٩١٤)، وانەبێژی فەلسەفە لە زانکۆی هارڤاردی ئەمەریکا، ناوبراو کەوتبووە ژێر کارتێکردنی (کانت)ەوە[***]، وێڕای بایەخدانێکی قووڵ بە لۆژیک و ڕەوشت، لە فەلسەفەی هاوچەرخدا یەکەم کەس بوو وشەی (پراگماتیزم)ی دانا، ئەویش لەو کاتەدا کە خۆی لە قەرەی گرفتی زانین دا.

(*) ولیەم جیمس (جیمس - Jams /١٨٤٢-١٩١٠) فەیلەسووفێکی ئەمەریکییەو یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ڕێبازی پراگماتیزم و یەکێکە لەوانەی دەڵێ ڕاستی هیچ بەهایەکی نییە گەر کار لە واقیع نەکات.

(**) جۆن دیوی (دیوی - Dewey /١٨٥٩-١٩٥٢) فەیلەسووفێکی ئەمریکییە، لە فەلسەفەو کۆمەڵناسی و جوانناسی و زانستەکانی پەروەردەدا دەستێکی باڵای هەبوو لە وڵاتەکەیدا.

(***) ئەمانۆیل کانت (کانت - Kant /١٧٢٤-١٨٠٤) فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە، دامەزرێنەری ئایدیالیستی ڕەخنەگرانەیە.

جا گـوتوویەتی: جـۆرەها بیـرۆکـە لە ئاوەزمـاندا جـێگیـرن و لە جیهانی دەرەوەماندا بەرانبەری ماتریاڵییان هەیە، پێوەری راستی و ناڕاستیی ئەم بیرۆکانەش لە رادەی جووت و ناجووت بوونیان دایە لەگەڵ بەرانبەرە ماتریاڵییە دەرەکییەکانیاندا، لەگەڵ ئەوەی لە هەمان کاتدا جۆرە بیرۆکانێک لە نێو ئاوەزماندا هەن و لە بەرانبەرا لە ماتریاڵی دەرەکیدا نانوێن، کەواتە پێوەری حوکم کردن بەسەر راستی و ناڕاستییاندا دەبێ چۆن و چی بێت؟

پێرس لە وەڵامی ئەم پرسیارە گوتوویە: ئەو بیرۆکانە راستن گەر هاتوو رێی ئەنجامدانی کارێکی کردارەکییان خۆش کردو مەبەستیشیان جێبەجێ کردنی سوودێکی کردارییانە بێت، دوور لەوەش بە درۆ دەکەونەوە.

بۆ نموونە بیرۆکەی بوونی خودا، ئایا راستە یا ناڕاستە؟ من ناتوانم لە بەرانبەرێکی ماتریاڵیی دەرەکییانەی بگەڕێم و، بە هۆیەوە بتوانم بڕیاری رادەی جووت بوون یا ناجووت بوونی لەگەڵدا بدەم بۆ دڵنیا بوون لە راستیی بیرۆکەکە، بەڵکو بڕیاری من لەسەر راستی و ناڕاستیی ئەم بیرۆکەیە پەیوەستە بەو ئاکامانەی لێی دەکەونەوە، هەروەها بەو کارە کرداری و سوودبەخشانەی کە لە لای کەسان و کۆمەڵدا ئەگەری پەیدا بوونیان هەیە بە هۆی بیرۆکەکەوە، لەبەر ئەوەی کاتێک کەسان باوەڕ بە بیرۆکەی بوونی خودا دەکەن، بەرەو چاکەو خوداپەرستی و چاک رەفتارییان دەبات، لەپاڵ راستگۆیی و گیانی هاریکاری و ئەنجامدانی کاری چاک، هەموو ئەمانەش جۆرەها رەفتاری کردارییانەی سوودبەخشن، جا بەم شێوەیە بیرۆکەی بوونی



خودا بەم شتانەوە راستە نەک ناڕاست.

بەم چەشنە (پێرس) بیرۆکەی کردە رێ نیشاندەری کارو ئاراستە کردنی رەفتارو بزواندنی چالاکی، بیرۆکەش لە سنووری خودی خۆیدا نەڕاستەو نەناڕاست، بەڵکو بیرۆکە تەنها پرۆژەو پلانی کارکردنە، جا پرۆژەو کارەکە گەر گەیشتە ئاستی ئەنجام دانی کردارییانەی هەموو ئامانجەکانی، بیرۆکەکە راست و دروستە، خۆ گەر هیچ شتێکیش بە ئەنجام نەگەیشت ئەوسا بیرۆکەکە ناڕاست و چەوتە.

لێرەڕا (پێرس) چەمکی راستی و درۆی گۆڕی کە لەوەو پێش فەیلەسووف و لۆژیکزانەکانی جاران لەسەری رۆیشت بوون، راست و درۆی بەستەوە بەو ئەنجامە کردارییانەی کە لە خودی بیرۆکەکانەوە دەکەونەوە، هەروەها راستیی بیرۆکە بەندە بە توانا شاراوەکانی کارکردن تێیداو، لە رەفتارە کردارەکییەکانی، کە لەوانەیە لە هەڵس و کەوتی مرۆڤدا بنوێ.

بەم پێیە (پێرس) هەموو رێڕەوێکی میتافیزیکی یان ئایدیالی رەت کردەوەو، ئەم رێڕەوە کردارییە سوودگەیێنەی بۆ خۆی هەڵبژارد، کە پاشتر کارێکی زۆری کرد لە دنیای فەلسەفەو بیرکردنەوەدا، بە تایبەتی لە دووەم فەیلەسووفی پراگماتیزم (ولیەم جیمس)، کە پەرەی بە رێبازی مامۆستاکەی داو، بەهۆی تیۆرییە ناودارەکەی دەربارەی راستەقینە، چەمکەکانی ئەم رێبازەی بە قووڵدا برد. پاشتریش (جۆن دیوی) هات بەرنامە فەلسەفی و پەروەردەییەکەی ئەو رێبازەی تەواو کرد.

## پوختەی راکانی ولیەم جیمس

ولیەم جیمس بڕیاری ئەوەی داوە کە پێوەری راستەقینە ئاوەزی نییە، بەڵکو ئەو رەفتارە سوودگەیێنە کردارییەیە کە لێی دەکەوێتەوە، جا بەم جۆرە جیمس هێڵ بە نێوانی دوو جۆر راستی لە مەسەلەکاندا دەکێشێت، راستییەک لەسەر رادەی جووت بوونی مەسەلەکە لەگەڵ واقیعی دەرەکیانەدا دامەزراوە، لە حاڵەتی جووت بووندا راست دەبێت، ناجووت بوونیش دەیکاتە درۆ.

راستییەکی دیش لەسەر ئەو هەوڵەی لە پێناو دەست بەسەر راستەقینەدا گرتن و سوود لێوەرگرتنی کردارەکیانە دامەزراوە، مەسەلەو بیرۆکە راست دەبن، گەر هاتوو بەرەو ئەنجامی کردارییانەی سوودگەیێن چوون و لە ژیانی تاکە کەسدا سوودبەخش بن، راستەقینەش لەو کارانەدا مت دەبێت کە خۆی رێی جێبەجێ بوونیان خۆش دەکات، نەک بە سروشتی خۆرسکانەی خۆی. ولیەم جیمس لەم کارەیدا سوودی لە رێرەوی ئەزموونگەری وەرگرت، بەوەی مەحەکە بۆ بیرۆکەو ئەو رێگایەشە کە هەموو ئاکامە کردارەکییە بەرشیاوە (ممکنە)کانی لێوە دەردەچێت.

ولیەم جیمس رەخنەی لە پەیڕەوکەرانی رێبازی ئایدیالی (المذهب المثالي) گرت، چونکە وا بۆ شتان دەچن گوایە وێنەی ئاوەزییان لە نێو هزرماندا هەیە، جا دەڵێ: بوونی ئەو وێنانە یا نەبوونیان هیچ شتێک لە کرۆکی راستەقینە نە کەم دەکات و نە زیاد، بە هیچ



جۆرێکیش کار لە سروشتی شتان ناکات، بەڵکو فەرمان ئەوەیە کە هەوڵی ئەوە بدەین راستەقینەی کردارییانە بگرینە دەست، بە کردار سوودیشی لێوەرگرین.

بە نموونە هەبوونی وێنەیەکی ئاوەزیی ئاگر لە هزرماندا کە نە دارو نە کاغەزی پێ دەسووتێت، هەروەها هەبوونی وێنەیەکی ئاوەزیی ئاو لە توانایدا نابێت ئاگرێکی هەڵبوو بکوژێنێتەوە، ئەم وێنانە چ نرخێکیان نییە کە هەر بۆ خۆیان و لە پێناوی خۆیاندا لێیان بکۆڵینەوە، چونکە کردارەکیانە کار لە ژیانمان ناکەن، هەروەها هیچ ئەنجامێکی کردارەکیانەیان لێ ناکەوێتەوە.

هەر لەبەر ئەوەش بوو دەبینین ولیەم جیمس گفتوگۆ کردنی بابەت و مەسەلە میتافیزیکییەکان رەت دەکاتەوە، لە چەشنی، ئایا گێتی یەکە یان زۆرە؟ ئایا بوونەوەر ماتریاڵییە یا رۆحی؟ ئایا مرۆڤ ئازادە یا کۆیلە؟ زۆر مەسەلەی دیکەی غەیبیانەی لەم چەشنە، کە بەرەو ئاکامی سوودبەخشی کردارەکیانەمان نابەن، لەبەر ئەوە راست نین.

بەم شێوەیە ولیەم جیمس بەو ئاکامە گەیشت کە راستەقینە هەموو شتێکە، لە ژیاندا بەرەو سەرکەوتنمان دەبات و بیری راست یەکەم دۆزەرەوەی رێگای سەرکەوتنی کردارەکیانەیەو هۆی پێکەوەنانی ژیان و ئامرازی دەست بەسەردا گرتن و ئاراستە کردنیەتی بەرەو هەموو شتێکی سوودبەخش و چاک بۆ مرۆڤ.





## گیانایەتی لە لای هێنری برگسۆن(*)

### بارودۆخی سەرهەڵدانی گیانایەتی و بەناوبانگترین فەیلەسووفەکانی

ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی زانستە سروشتییەکان بەهۆی ڕێڕەوی ئەزموونگەرییەوە بەدەستیان هێنا، هەروەها زانستە مرووڤایەتییەکانیش بە هەمان ڕێڕەوی ئەزموونگەری پێشکەوتنێکی زۆریان بە دەست هێنا، هەموو ئەم شتانە بوونە پاڵپشتی لایەنی ماددییانە لە چاخی نوێدا بە گشتی و لە سەدەی بیستەمدا بە تایبەتی. جا شیکردنەوەی ماتریاڵیانە (التحليل المادي) دیاردە سروشتی و دیاردە مرۆڤایەتییەکانیشی گرتەوە، تا ڕادەی ئەوە مرۆڤیش خەریک بوو ببێتە دیاردەیەکی سروشتی وەکو هەر دیاردەیەکی دیکەی سروشت، بەڵام تەنیا ئەم لەوان ئاڵۆزترە.

(*) گیانایەتی/ (الروحيه).





خودی دیاردە گیانییەکان بوونە بەرجەستە بوونەوەی دیاردە ماددییەکان لە لەشی مرۆڤدا، بەم شێوەیە مرۆڤ قەوارە ئاوەزی و گیانییەکەی لە دەست دا کە تەنیا شتێکن لە دیاردەکانی دیکەی جودا دەکەنەوە.

زۆر ڕێبازی ماددی و میکانیزمی لە فەلسەفەدا سەریان هەڵدا، مرۆڤیش مرۆڤایەتییەکەی لە دەست دا، ڕەفتاریش بووە چەند بزووتنێکی میکانیکی لەسەر بنچینەی (بزوێنەر) و (لێهاتنە دەنگ)، بیرکردنەوەش بووە چالاکییانێکی میکانزیمی ڕووت و، گیان (ڕۆح) بووە خەیاڵ پلاوییەکی بێ بناغە.

زاڵ بوونی ئەم ڕێڕەوە ماددییە لە سەدەی بیستەمدا بووە مایەی کاردانەوەیەکی بەهێز، ئاڵاکەی لە دەستی چەند هزرەوەرو فەیلەسووفێکی دەربەست بە مرۆڤ و پڕ باوەڕ بە قەوارە گیانییەکەی و سروشتە چالاکەکەی، کە بە تەواوی لە سروشتی وشکی مادده جودایە، شەکایەوە، ئەم هزرەوەرانەش بەرپەرچی ڕێبازە ماددییەکانیان دایەوە، چ لە دەروونناسیدا بێت یا لە تیۆری پەرەسەندن (نظرية التطور)، بێ لە ڕەخنەگرتن لە زانستی ئەزموونگەری ماددی و دووپات کردنەوەی بایەخی مەزنندە (حدس) و کاری زیندووانەو ئیرادەی ئازاد.

لە پێشەوەی ئەو فەیلەسووفانەی کە ئاڵای ئەم ڕێڕەوە گیانی و چالاکەیان هەڵگرت، فەیلەسووفی فەرەنسی (مین دی پیران)بوو، کە بیرو باوەڕە سەرەتاییەکانی ئەم ڕێڕەوە تازەیەی دانا، دواتریش

فەیلەسووفی دیکەی فەرەنسی شوێن پێیان هەڵگرت وەکو: (رافیسۆن)و (لاشیلێ) و (بوترۆ) و (بلۆندل)، پاشان (برگسۆن)و[*] هی دیش، بەڵام برگسۆن لە هەموویان ناودارترو لە فەلسەفەدا قووڵترو بەڵگە رەوانتر بوو، وێرای ئەوەی کە قوتابیی هەندێکیان بوو، بەڵام پاشتر بووە یەکە ئاڵا هەڵگرو پارێزەری رێبازی گیانایەتی لە سەدەی بیستەمدا.

## پوختەی رایە فەلسەفییەکانی هینری برگسۆن

سەرەتا کۆششی فەلسەفیی برگسۆن بە خوێندنی رێبازی ماتریالیزم دەستی پێکرد کە (هیربرت سپنسەر)[**] لە تیۆرییەکەیدا دەربارەی پەرەسەندن بانگەێشتی بۆ کردووە، پاشتر زانا ئەزموونگەرەکانی دەروون لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمداو سەرەتای سەدەی بیستەمدا پێی گەیشتن، پاشان هێرشی کردە سەر تیۆری پەرەسەندن کە هەموو پێکهاتەکانی مرۆڤی بە ماددەی رووت لە قەڵەم دا و نکوڵی لە بیرکردنەوەی رووت و گیانی واتایی کرد. هەروەها هێرشی کردە سەر دەروونزانە ماتریالیستەکان بە بڕیاردانی ئەو جیاوازییەی لە نێوان

(*) هینری برگسۆن (برغسون – Bergson/ ١٨٥٩-١٩٤١) فەیلەسووفێکی فەرەنسییە، داکۆکیی لە گیانایەتی کرد دژ بە رێبازە ماتریاڵی و رەوشگەری (الوضعیه)یەکان.

(**) هیربرت سپنسەر (سبنسر– Spencer/ ١٨٢٠-١٩١٣) فەیلەسووف و کۆمەڵناسێکی ئینگلیزە، خاوەن رێبازێکی پەیوەست بە پەرەسەندنی سروشتییە، واتە رێبازی پەیدابوون و باڵابوون (النشوء والارتقاء).





دوو جۆر دیاردەدا هەیە؛ دیاردەگەلێکی لەشی و ماتریاڵی و دیاردەگەلێکی دەروونی و گیانی، کە جیاوازیی گەوهەری لە نێوانیاندا هەیە، لایەنگرانی رێبازی ماددی لە دەروونزانیدا بە لایدا نەچوون، دیاردە لەشییەکان بریتین لە ماددەیەکی زیاد بوو و لە راستەقینەدا دابڕاو، هەروەها بە پچڕپچڕی بە دوای یەکدا دێت و، بریتییە لە چەندێکی هەست پێکراو و لە توانا دایە بخرێتە بەر تۆژینەوەی ئەزموونگەرانەو پێوانەی چەندایەتییەوە.

بەڵام دیاردە دەروونییەکان بە تەواوی پێچەوانەی ئەمەن چونکە نەپساوەن، لە ناخڕاو لە خۆڕاوە دروست دەبن، هەروەها لە بەردەوامی و دروست بوونەوەی هەمیشەیی دان بێ دابەشبوون و بێ فرەبوون، چۆنایەتییەکی رووتەو ناخرێتە بەر تۆژینەوەی ئەزموونگەرانە یا پێوانەی چەندایەتییەوە.

جا بۆیە هەڵەیەکی گەورە دەکەین گەر هاتوو ئەم دوو جۆرە دیاردە جودایە تێکەڵ بکەین، دەروونزانە ئەزموونگەرەکان کەوتنە هەڵەیەکی گەورەوە، کاتێک سیفاتی تایبەت تەنها بە دیاردە لەشییەکانی ماددەیان دایە پاڵ دیاردە دەروونییەکانی چەشنی درێژی یا کورتی یا چڕی یا قووڵی و هی دیکە، کە تایبەتن بە قەبارە ماددییەکانەوە، دیسانیش بە هەڵەدا چوون کاتێک دیاردە دەروونییەکانیان بە رەنگدانەوەی لەش و شوێن و جێ دەستی هۆی ماددییانەی سروشتی لە قەڵەم دا، هۆی هەڵەکەش لەوە دایە کە جیاوازییەکی رژد لە نێوان سروشتی دیاردە دەروونییە جۆرەکییەکان و دیاردە لەشییە ماددییەکاندا بەدی دەکرێت. بەم شێوەیە برگسۆن سەربەخۆیی لایەنی

دەروونی و گیانی لە مرۆڤدا دەسەلمێنێ و بوونی دووپات دەکاتەوە بە
پێچەوانەی بڕیاری ماتریالیستەکان.

ئەو جیاوازییەی رابردوو ئاکامێکی گرنگی خستەوە، ئەویش جودا
کردنەوەی ئاوەز وەکو هۆیەک بۆ دەرک کردن بە تەنە ماتریاڵەکان و،
رووداوە بەرهەستەکان و مەزەندە (دڵ خەبەردان) وەکو هۆیەکی ناخی
(باطني) بۆ دەرک پێکردنی راستەوخۆیانەی هەموو شتێکی جۆرەکی
و زەمانی. لە راستیشدا لە توانای ئاوەز دایە کە شیتەڵکاری بکات
و گەوهەری شتان بدۆزێتەوەو بیانکاتە یاسای روون و ئاشکرا، لە
هەمان کاتیشدا کلۆڵە لە ئاست دەرک پێکردنی بزووتنی بەردەوام و
ناتوانێ بوونی چالاکانەی زەمانیی یەکالا بکاتەوە، کە تایبەتە تەنها
بە مەزەندەوە.

کەواتە ئاوەز شیکاری و لێکدانەوە دەکات بۆ دەرک کردن بە
راستییە هەندەکییەکانی ماددی (الحقائق المادية الجزئية) و دەیانکاتە
هۆیەک بۆ خزمەت کردنی ژیانی کردارییانە، بەڵام مەزەندە بە
پرۆسێسێکی روانینی گشتی و راستەوخۆ بە راستەقینەوە دەنووسێت
بۆ ئاشکرا کردنی گەوهەرەکەی، بە تایبەتی لە بواری چالاک و لە
چێوەی گیانیدا. ئەو دابەش کردنەی پێشوو لە نێوان ماتریاڵی هەست
پێکراو و نەفسی رۆحی، واتا دابەش بوونی بوون بە دوو بواری
بنچینەیی دەخاتەوە: بواری ماددەی وشک و بەرچاو، ئەمەش ئاوەز
هۆی دەرک پێکردنیەتی و؛ بواری ژیانی واتاییانەی هۆشیار، کە لە
تازە بوونەوەی بەردەوام دایەو بە مەزەندە دەرکی پێدەکرێت.





بەم شێوەیە برگسۆن سەربەخۆیی لایەنی پێکهاتە دەروونییەکەی لە
لەشی ماتریاڵیدا دووپات کردەوەو بە گیانی زیندووەوەی شەتەک دا،
کە ئەمیان بە سروشت بە تەواوی سەربەستەو لە بەردەوامییەکی
داهێنەرانە دایە، بە پێچەوانەی لەشی ماتریالانە کە ملکەچی
میکانیزمییەکی دیاریکراو و ناچارایەتی (جبرية)یەکی هەمیشەییە،
گیان جۆرەکییەکی رووتە (كمية مجردة)و ملکەچی ئەم
میکانیزمییەو ئەو ناچارایەتییە نابێت، واتە مرۆڤ لە گەوهەرە
گیانییەکەیدا سەربەستە، بەڵام کۆت لە دەستەو لە ژێر باری ناچاری
دایە بە هۆی هەبوونی لەشی ماتریاڵییەوە، کە دیاردەیەکی لاوەکییەو
راستەقینە گیانییە بەردەوامەکە نانوێنێ.

ئەگەر گیان گەوهەرە راستەقینەکەی مرۆڤ بێت، لە لای برگسۆن
ئەو رەگەیە کە بوونی ماتریالانەی لێوە دروست بووەو رواوە،
ماتریالیستەکان دیاردە دەروونی و گیانییەکانیان بەرەو رەگی تەنیی
ماددیانە بردەوە، برگسۆن بارەکەی وەرگێڕاو هەموو بوونی ماتریالانەی
بۆ رەگێکی رۆحی بردەوە، کە لێیەوە دەرچووەو لەبەریەوە پەرەی
سەندووە. ئەو قەبارە گەردوونیانەی لە ژمارە نایەن و بوونەوەریان
پێکهێناوە لە رەسەندا هەڵم و گازی جۆراو جۆر بوون، پاشتر چڕ
بوونەوەو بوونە ئەو ماددە سڕە، ئێستاشی تێدا بێت دەیانی دیکەیان
لێ چڕ دەبێتەوەو، بوون هەمیشە لە بزووتنێکی بەردەوامدا دەبێت.

سەرەنجام بوون لە مەڵبەندێکی رۆحی بنچینەییەوە کە خودایە
رسکاوە، لەویشەوە لێشاوی بەستووە، چەشنی پریشک و تۆبزو

چەپکی بەردەوام، لە بزووتنی زیندووانەیە، کە گەوهەری بوونەکەیەتی و هەندێ لە بەشەکانیشی لە فۆرمی ماتریاڵیدا خەست بووەتەوە، پاشـــان زیندەوەران پەرەیان ســـەند بە هۆی بازدان یا راپەڕینی زیندووانەوە لە بێ گیانانیان جودا دەکاتەوە بەوەی بێ گیانان گۆڕان و پەرەسەندنیان میکانیکییە.

پوختـەکـەشی ئەوەیە کـە مـاتریاڵ لە گـەوهەرە رەسـەنەکـەیدا دیاردەیەکە بە جۆرەها چەشن لە بوونەوەردا دەخەملێ، هەموو گێتیش لە بەردەوامییەکی داهێنەرانەو بەردەوامییەکی هەمیشەیی دایە.







## شیکارایەتی(*)

### بارودۆخی دروست بوونی
### شیکارایەتی و دامەزرێنەرە ناودارەکانی

ئەو پێشکەوتنە زانستییە گەورەیەی لە سەدەی بیستەمدا بەدیهات بە قووڵی کاری لە بزووتنەوە هاوچەرخەکانی فەلسەفە کرد، هەمان شتیش ئەو پێشکەوتنەی زانستەکانی بیرکاری لەم کاتەدا بە دەستیان هێناوە رۆڵیان گێڕا، هەردوو لایان هاتنە دەست و ئاسۆگەلێکی تازەی زانین و دۆزراوەیان خستە بەر دەستی مرۆڤایەتی، کە هەرگیز بە خەیاڵی چ مرۆڤێکدا نەهاتووە. لە پێشەوەی هەموو ئەو دۆزراوانە هەڵوەشاندنی ئەتۆم و گێڕانەوەی هەموو شتە ماددییەکانی گێتی بۆ گەردیلانێکی بچووک، پاشان گەیشتن بە رادەی توونا (افناء) کردنی ئەو گەردیلە ئەتۆمیانەو ئاشکرا کردنی گەوهەرەکەی و سوود وەرگرتن لە وزەکەی، لەگەڵ ئەوەی باوەڕی پێشین لەم بارەیەوە دەیوت: ئەتۆم و گەردیلە کەرت و پەرت ناکرێن. هەموو ئەمانە، زانست لە رێی رێڕەوە ئەزموونگەرییەکەی وابەستە بە بیرکاری و رێڕەوە شیکارییەکەی پێیان گەیشت.

(*) شیکارایەتی- (التحلیلیە).



دیارترین سیمای سەدەی بیستەم ئەوەیە کە (چاخی شیکاری)یە جا ئەو شیکارییە چ ماددی بێت یا بیرکاری، هەموو ئەو شتانە وایان لە زۆربەی هزرەوەرە هاوچەرخەکان کرد لە رێڕەوی ئایدیالییەوە بەرەو رێڕەوی ریالیزم وەرچەرخێن، بەوەی زەمینە ماددییە شیکارەکەی سەدەی بیستەم بە پێداویست بەروبوومە هزرییەکەی واقیعیانە کەوتەوە، ئەو واقیعەش چ ماددی بێت یا شیکاری، سروشتی بێت یا مرۆڤانە، هەروەها ئەمە رێی هاتنە کایەی هەندێ رێڕەوی ئایدیالیستانەی هاوچەرخی نەگرت، بەڵام ئەمان کەم بوون و زەمینەی بەپێتیان بۆ نەڕەخسا چەشنی رێڕەوە ریالیستەکان بۆ ئەوەی نەشونمای تێدا بکەن.

جا بەم شێوەیە مۆرکە گشتییەکەی فەلسەفەی هاوچەرخ مۆرکێکی شیکاری واقیعیانە بوو، کە هاوجووتە لەگەڵ دۆخە زانستی و بیرکارییەکەی سەردەم و شان بە شانی تازەترین دۆزراوە زانستییەکان و دوا ئاکامەکانی بیرکاری دەڕوات، چونکە فەلسەفە گوزارشتە لەو چاخەی کە سەری تێدا هەڵداوە، هەروەها قووڵ بوونەوەی تیۆریانەی رووداوەکانی تایبەت بەو سەردەمەیە. لەبەر ئەوە گەلێ رێبازی فەلسەفیی هاوچەرخ لەژێر سایەی رێڕەوی ریالیستی شیکارانە (الواقعیة التحلیلیة) هاتنە کایە، زۆربەی فەیلەسووفە هاوچەرخەکان کودەتایان بەسەر چەمکەکانی رەهاو ئایدیالی و رێبازەکانی دیکەی لەم چەشنەدا کرد، کە لە دوو سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا باوبوون، ئەویش لەبەر نەگونجانیان لەگەڵ گیانی سەدەی بیستەمدا.

شاراوە نییە، زۆر فەیلەسووفی ریالیستی شیکاری هاوچەرخ لە

ڕێبازە فەلسەفییەکانیاندا سەرەتا وەکو قوتابیی (کانت) و (هیگل) هاتنە دەست، بەڵام هێندەی نەبردو زوو لە ئایدیالیستی و ڕەهاییەکەی ئەوان وەرچەرخان بەرەو ڕێڕەوانێکی دیکەی ریالیست و ماددیبیانەی شیکاریی گونجاو لەگەڵ بارودۆخی سەدەی بیستەمدا.

لەوانەشە دیارترین ڕێڕەوی هاوچەرخی فەلسەفە کە گیانە زانستییە بیرکارییەکەی دەربڕی بێت ڕێڕەوی (شیکارایەتی)یە، کە کۆمەڵێک ڕێبازی هاوگونجاو دەگرێتەوە وەکو (ریالیزمی نوێ) کە فەیلەسووفی ئینگلیز (جۆرج مۆر) دایمەزراندو پاشتر (برتراند راسڵ)(*) و (ئەلفرێد نۆرت هوایتهید)(**) درێژەیان پێدا، هەروەها (ڕەوشگەریی لۆژیکی/ الوضعیة المنطقیة)، کە سەرەتا لەسەر دەستی (موریس شلیک) لە ڤیەننادا پەیدا بوو، پاشتر (ئایەر) و (کارناب) و هی دیکە بوونە ئاڵا هەڵگری.

لە ڕاستیدا ناودارترین کەسێک کە هێڵە گشتییەکەی فەلسەفەی هاوچەرخی شیکارایەتی دەربڕی بێت (برتراند راسڵ)ە، کە تازەترین ئاکامەکانی بیرکاری و دوا دۆزراوە زانستییەکانی ئەتۆمی لە فەلسەفەکەیدا کۆکردەوە، مێژوونووسانیش فەلسەفەکەی بە (فەلسەفەی شیکارایەتی یا بیرکارایەتی) هەروەها (ریالیزمی

(*) برتراند راسڵ (رسل- Russel/ ١٨٧٢-١٩٧٠) ماتماتیکناس و فەیلەسووفێکی ئینگلیزەو لە دامەزرێنەرانی لۆژیکی نوێیە، بە توندی دژ بە چەکی ئەتۆمی وەستا.

(**) ئەلفرێد نۆرت هوایتهید (هوایتهید - Whitehead/ ١٨٦١-١٩٤٧) زانایەکی لۆژیک و بیرکاری و فەیلەسووفێکی ئینگلیزە، بە هاوبەش لەگەڵ راسڵ کتێبێکی گرنگی لە لۆژیکی بیرکاریدا داناوە.





ئەتۆمی) یا (ریالیزمی نوێ) و گەلێ ناوی دیکەی ناو دەبەن، کە گونجاون لەگەڵ گەوهەری فەلسەفەکەی و شان بەشانی گیانی سەردەم بەرێوەیە، راسڵ لەو کەم فەیلەسووفانەیە کە فەلسەفەکەیان دەگۆڕی و پەرەیان پێدەدا بەپێی دۆزراوە بیرکاری و زانستییەکان.

## بوارەکانی شیکاری لە فەلسەفەکەی راسڵدا

فەلسەفە شیکارایەتییەکەی راسڵ لەم بوارانەدا دەگیرسێتەوە: شیکردنەوەی ماتماتیک، شیکردنەوەی گێتی، شیکردنەوەی بیر، پاشان شیکردنەوەی زمان، جا لە هەر بوارەدا چیی بڕیار داوە؟ چ پەیوەندیگەلێک هەر هەموویان پێکەوە دەگرێت؟

أ- شیکردنەوەی ماتماتیک و گێڕانەوەی بۆ سەر لۆژیک: ئامانجە سەرەکییەکەی راسڵ لە ڕێڕەوە شیکارییەکەیدا گەڕانەوەی بوو بۆ توخمە ساکارو سەرەتاییەکان و یەکە بنچینەییە هەندەکییەکان (الوحدات الجزئیة الاساسیة)، کە هزرو بوونیان لەسەر دامەزراوەو زانست و زانینیشیان لێوە دەست پێدەکات، چونکە ئەم شیکردنەوەیە ڕاستیی ئەو توخمە هەندەکییانە ڕوون دەکاتەوە، هەروەها پەیوەندییەکانی نێوانیشیان ئاشکرا دەکات، وەکو هەوڵێک لە لایەن راسڵەوە هاتە دەست بۆ دووپات کردنەوەی بەهای ئەو توخمە بنچینەییانەو ئەو یەکە هەندەکییانە، لەگەڵ نیشاندانی گرنگیی پەیوەندییەکان بە گشتی و ئاشکرا کردنی بەها ڕاستەقینەکەیان کە زۆربەی فەیلەسووفان پشت گوێیان خستبوو.

راسڵ ئەم ڕێڕەوەی یەکەم جار لە بیرکاریدا بەکاربرد بۆ ئەوەی یەکە بنچینەییەکانی کە ماتماتیکیان بۆ دەگەڕێتەوە دەست نیشان بکات و بۆ ئەوەی جۆری ئەو پەیوەندیانە روون بکاتەوە، کە لە نێوانیان دایەو دووپاتی هەبوونی قەوارەیەکی سەربەخۆی بۆ کردنەوە. بەم کارە شیکارییەی هەوڵی بیرکارانی پێش خۆی تەواو کرد، بە تایبەتی مامۆستاکەی خۆی (پیانۆ)، کە هەموو زانستەکانی بیرکاریی بەرەو زانستی ژمارە بردەوە، پاشان کەوتە شیکردنەوەی زانستی ژمارەو گێڕانەوەی ئەم زانستە بۆ سێ توخمی ساکار ناوی (نەزانراوەکان)ی لێنان و بریتین لە: سفرو ژمارەو گرووپ.

(پیانۆ)[*] وای بۆ چوو کە ئەمانە دوا توخمێکن کە لە تواناداد دەبێت ژمارەیان بۆ شی بکرێتەوە، بەڵام کە راسڵ هات و ڕێڕەوی شیکاریی بەکار برد بۆ یەکالا کردنەوەی ناواخنی بیرۆکەی ژمارە، دیتی کەوا ئەویش بەرەو بیرۆکەی (گرووپ) دەگەڕێتەوەو ئەمیش باسێکە لە باسەکانی لۆژیک، بەوەی گرووپ بەپێی گفتی راسڵ (تەنها شێوەیەکی گۆکردنە)و هۆیەکی ساکارە لە قسەکردن دا بەکاری دەهێنن بۆ دەربڕینی ئەو بەها گۆڕاوانەی کە دەخرێنە پاڵ مەسەلەکان.

بەم شێوەیە راسڵ دیتی کەوا لە کاتی شیکردنەوەدا توخمە سەرەتاییەکانی ماتماتیک دەگەڕێنەوە سەر لۆژیکزانی و گرفتە بیرکارییەکانی، لە راستەقینەداو هەروەکو لە کاتی پشکنین بۆ

(*) جیوزیە پیانو (پیانو – Peano /١٨٥٨-١٩٣٢) لۆژیکناس و ماتماتیکناسێکی ئیتالییە، لە دامەزرێنەرانی لۆژیکی بیرکارییە.



چارەسەر کردنیان دەبنە گرفتی لۆژیکی و لە ڕێی شیکردنەوەی لۆژیکییەوە دەگەینە چارەسەرکردنی ئەو گرفتە ماتماتیکیانە.

ب- شیکردنەوەی جیهانی ماتریاڵ: راسڵ لەسەر هەمان رەوتی پێشین ڕۆیشت، هەوڵی گێڕانەوەی زانستی ماتریاڵی دا بۆ یەکە هەندەکییە رەسەنەکانی (الوحدات الجزئية) کە پێکی دەهێنن، بەم رەوتەی هاوشانی تازەترین دەسکەوتەکانی زانستی ئەزموونگەرو دوا دۆزراوەکانی ئەتۆم و هەڵوەشاندنی ئەتۆم ڕۆیشت.

سەرەتا بەو بڕیارە دەست پێدەکات: مادده لە کاتی شیکردنەوەیدا دەبێتە تەنها کۆمەڵە هەستێک (کۆی هەست) کە لە نێو خۆیاندا لە جۆرە پەیوەندییەک دان، پاشتریش مادده دەبێتە هێمایەک راداشتی گرووپێک دەکات، ئەو گرووپەش کۆمەڵە دیاردەیەکە بە هەست لە چەندان گۆشەی دیاریکراوەوە دەرکی پێدەکرێت، دواتریش کۆدەبێتەوە بۆ ئەوەی بچێتە فۆرمێکی دیاری کراوەوە.

راسڵ لە فەلسەفەکەی دەربارەی زانستی ماددییانە بە ڕێچکەی فرە ئەتۆمی (التعددية الذرية)دا دەڕوات کە هاوجووتە لەگەڵ تیۆری ئەتۆمیدا، مادده لە رەسەنداو لە کاتی شیکردنەوەیدا دەگەڕێتەوە سەر چەندین بەشی زۆر زۆر بچووک کە ئەتۆمە، بەڵام ئەو یەکە زۆر زۆر بچووکانە لە راستیدا ساکار نین، بەڵکو ئەوانیش تێک هەڵکێشن لە پەیوەندی و رووداوی کارکەر، واتە ماتریاڵ نەک تەنها بۆشاییەکە شوێن دەگرێتەوەو بەس، بەڵکو لە رووداوی زەمانیی (الحدث الزماني) پەیوەندداری بەو شوێندا دەژیت، پاشان مادده دەبێتە شوێن و





کات پێکرا، هەروەکو (ئینشتاین)[*] لە تیۆری ڕێژەییدا بڕیاری داوەو هەروەکو زاناکان گەیشتنە هەڵوەشاندنی ئەتۆم و دۆزینەوەی ئەوەی کە مادده لە بنچینەدا تەنها (کەهرەبات) کارەباگەلێکی بزواوە بە هۆی پەیوەندیی جۆراو جۆرەوە، کە لە نێو ئەتۆمدا یەکدی دەگرێت، لەبەر ئەوە راسڵ بڕیاری دا، کە مادده کۆمەڵە هەستێکەو تەنها هێمایەکە بە هەست دەرکی پێدەکرێت، مادده بەم شێوەیە ماددییەتی خۆی لە دەست داو بووە کۆمەڵێک رووداوی هەندەکی، بەڵام چۆن دەرکی پێدەکرێت؟ چییە جۆری ئەو ئاوەزەی دەرکی پێدەکات؟

ج- شیکردنەوەی بیرو ئاوەز: راسڵ بیرو زانینی شیکردەوە و بۆ یەکە بنچینەییەکانی گێڕانەوە، جا وتی، هەستکردن شتێکی ماددیی سەربەخۆ نییە، بەڵکو کۆمەڵە رووداوێکن تێیاندا هەستەکان راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بە دیاردەکانی دەرەوە دەگەن، ئەو پێک گەیشتن و کارلێک کردنە لە ڕێی کۆئەندامی دەمارییەوە راگوێز دەبێتەوە جەمسەری هەستەکان لە مێشکدا، پاشان ئەو دەرک پێکراوە هەستییە هەندەکیانە لە ڕێی کارە ئیدراکییە هەستییە جۆر بەجۆرەکانەوە کۆ دەبێتەوەو، دەچێتە قاڵبی کۆمەڵە رووداوێکی زنجیرەیی پێکەوە گرێ دراو، کە بە (ئیدراک) یا (زانین)ی ناو دەبەین، راسڵ وا دەبینێ زانینی راستەقینە ئەوەیە لە ڕێی ئیدراکی راستەوخۆیانەی دیاردە هەستییە هەندەکییەکانەوە پێی دەگەین، بەڵام

(*) ئەلبرت ئینشتاین (اینشتاین – Einstein/ ١٨٧٩-١٩٥٥) زانایەکی فیزیکی ئەمریکی و بە رەچەڵەک ئەڵمانییە، تیۆری ڕێژەیی داناوە.





زانینی ناڕاستەوخۆ کەم بەهاو دوورترە لە وردی لەوەی پێشوو، هەرچی ئاوەزیشە راسڵ بە شیکاری بەرەو کۆمەڵە رووداوێکی گۆڕاوی دەگێڕێتەوە، کە کۆمەڵە پەیوەندییەکیان لە نێوان دایە، لەمەشدا بە تەواوی چەشنی ماددەیە کە شی دەکرێتەوە.

بەم شێوەیە سنووری دابڕی نێوان بیرو مادده کەم کەم بە شیکردنەوە لە تەسکی دا، رووداوانیش لە راستەقینەدا نە وەکو ماددەی رووت مانەوەو نە وەکو بیری رووت، جا بۆیە راسڵ بانگهێشتی تیۆرییەکەی دەربارەی (ماددەی بێ لایەن) یان (یەکەی بێ لایەن) کرد، کە بە بنچینەی بوونی داناوە، مەبەستیش لەوە نە بیرو نە مادده، بەڵکو شتێکی بێ لایەن بێت، بشێت لە کاتی خڕبوونەوەیدا ببێتە ماددەو، ببێتە بیرو رووداوی واتایی لە کاتی شیکردنەوەدا.

د- شیکردنەوەی زمان و ئاخافتن: چونکە راستییە بیرکاری و ماددییەکان و بیر بە شیکردنەوە دەچنەوە سەر رووداوانی هەندەکی، کە بنچینەی راستەقینە دەنوێنێت و، چونکە رووداوانی ئاوەزو پەیوەندییەکانی هەندەکین و لەسەر راستیی دەرەکیی دیکەی هەندەکی دادەمەزرێن، لەبەر ئەوە ئەو زمانەی کە بۆ دەربڕینی ئەو ئیدراک و ئەو راستیانە بەکاری دەهێنین هەر دەبێ هەندەکی و راستەوخۆ بێت، بۆ ئەوەی ئەو گونجاویەی پێشوو تەواو بکات.

لە ڕێی شیکردنەوەی زمانەوە راسڵ گەیشتە ئەوەی کە دوو جۆر مەسەلەی بنچینەیی هەن:

چەند مەسەلەیەکی ساکاری هەندەکی کە دەربارەی رووداوانی هەندەکیی ساکاری دەرەکین، راسڵ بە (مەسەلە ئەتۆمی)یەکانیان ناو دەبات، پاشان مەسەلەیەکی (لێکدراو)ی ناڕاستەوخۆ کە لە دەوری چەند مەسەلەیەکی دیکەی ئەتۆمی دەخولێنەوەو راڤەیان دەکەن و لێیانەوە دەدوێن.

راسڵ (مەسەلە ئەتۆمییەکانی) بە یەکەی بنچینەیی داناوە کە بیرکردنەوە بەرەو (ئەو) دەچێتەوەو زمانیش بەرەو ئامێزی دێتەوە، پێوەری راستیی مەسەلەکان لەلای راسڵ بە جۆری مەسەلەکەوە بەندە، جا راستیی مەسەلە ئەتۆمییەکە وابەستەیە بە جووت بوونی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا، بەڵام راستیی مەسەلەیەکی لێکدراو، یەکەم بە شیکردنەوەی ئەو مەسەلەیە بۆ مەسەلە ئەتۆمییەکانی کە پێکیان هێناوە، پاشان گەڕان بە دوای رادەی جووت بوونی ئەو مەسەلە ئەتۆمیانە لەگەڵ واقیعی دەرەوەدا، بەندە.







# دیاردایەتی (فینۆمۆنۆلۆژیا-الظاهراتیة)

## واتای فینۆمۆنۆلۆژیاو بارودۆخی سەرهەڵدانی

فینۆمۆنۆلۆژیا پەیڤێکی لاتینییە بە واتای (زانستی دیاردەکان) یا (دیاردەزانی)(علم الظواهر)، گەرچی لە کوردی دا دەتوانین پەیڤی (دیاردەزانی) یا زاراوەی (دیاردایەتی)ی لە بریدا بەکار بهێنین، بەڵام پەیڤ و زاراوە لاتینییەکە (فینۆمۆنۆلۆژیا) وردترەو پتر برەوی هەیە، هەڵبەت مەبەست لەو زانستە ئەوەیە کە تەنها بایەخ بە دیاردەکانی بەرهەست دەدات و وەسفکارانە لێیان دەکۆڵێتەوە، لەپاڵ شیکردنەوەی هەست و ئاشکرا کردنی راستیی کرداری ئیدراک و پێکهاتەکانی.

ئەم زاراوە فەلسەفییە تا رادەیەک نوێیە، پێشتر (کانت) لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا بەکاری هێنا، کاتێک جیاوازیی نێوان رووکەش و ناواخنی شتانی پیشان دا، دواتر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا (هیگل) بەکاری هێناو کردییە ناوی زانستێکی فەلسەفیی تایبەت بە خۆی (زانستی دیاردەکانی گیان)(علم ظواهر





الروح)، کە تێیدا تا دوا رادە ئایدیالی بوو، پاشتر ئەم پەیڤە بە واتای جودا جودای تازە بەکار هات، تا (ئەدمۆند هۆسرڵ)[*] هات و فەلسەفەیەکی تەواوکار(متکامل)ی بەناو نا، کە هەر خۆشی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بناغەکەی دامەزراند، تا وای لێهات پەیڤی (فینۆمۆنۆلۆژیا) هاوجووتی ناوی ئەو بوو، وەکو گەورەترین نوێنەرو دامەزرێنەری لە فەلسەفەی هاوچەرخدا، ئەمەش کاتێک بوو کە ئەم فەلسەفەیە ناوبانگی پەیدا کردو کارکردنی پەلی بۆ زۆر لە فەلسەفە هاوچەرخەکانی سەردەم هاویشت و بەرنامەی هەندێ لە زانستە مرۆڤایەتییەکان کەوتنە بەر کارکردنی.

فینۆمۆنۆلۆژیا رەنگدانەوەیەکی راستەقینەی پەرەسەندنی ماتماتیکانەو زانستیانە بوو، کە بەسەر بیری نوێی رۆژاوادا هات، بە تایبەتی لە سەدەی بیستەمدا رێرەوی ماتماتیکی شیکاری (الاتجاه الریاضي التحلیلي) پێشکەوتنێکی مەزنی بەسەردا هات، وای لە فەیلەسووف و زانایان کرد، دەرک بە بەهاکەی بکەن و کارێکی گەورەیان لێ بکات و شوێن پێکەیان هەڵگرت، هەروەها رێرەوی ئەزموونگەری وەسفکارانەش (الاتجاه الوصفي التجریبي) بەو دۆزراوە زۆرە زانستیانەی کە لە ئاکامی بەکار بردنییەوە هاتنە دەست، وایان لە فەیلەسووفان کرد زۆر شتی لێ وەربگرن و دەست بدات بۆ پەرەپێدانی رێبازەکانیان، بەو چەشنەی لەگەڵ گیانی

(*) ئەدمۆند هۆسرڵ (هوسرل - Husserl/ ١٨٥٩-١٩٣٨) فەیلەسووفێکی ئەڵمانییەو دامەزرێنەری قوتابخانەی دیاردایەتی (فینۆمۆنۆلۆژیا)یە، فەلسەفەکەشی پشت بە کولتووری هزری ئەفلاتوون و لایپنتزو برنتانۆ دەبەستێت.

سەردەمدا بگونجێ و بەوەی کە هاوشانی پێشکەوتنی زانستی بڕوات، ئێستاش فەلسەفە وای لێهاتووە لەگەڵ هەموو ئەو رووداوو پەرەسەندنانەدا بڕوات.

فینۆمۆنۆلۆژیا – چەشنی فەلسەفەی شیکارایەتی – لە پێشەوەی ئەو فەلسەفانەدا بوو کە شوێن پێی شیکاری ماتماتیکی و وەسفی زانستیی هەڵگرت، (هۆسرڵ) ویستی فەلسەفە لە تەنها رێبازانێکی تیۆریی هاودژو بونیادگەلێکی بۆشی میتافیزیکییەوە بکاتە زانستێکی دوورگومانی ورد، کە بەرەو راستیگەلێکی دوورە گومانمان ببات و ببێتە بناغەی هەموو زانستە بەرتواناکانی دیکە، هەروەکو پێشتر کە (کانت) ویستی میتافیزیک وەکو زانستیکی راستی سەربەخۆ دابمەزرێنێ، (هۆسرڵ) رێڕەوێکی نوێی بۆ زانستی نوێ (فینۆمۆنۆلۆژیا) دەست نیشان کرد، کە لەگەڵ سروشت و ئامانجەکانیدا بگونجێ، رێڕەوێکی وا شیکاری ماتماتیکی و وەسف کردنی زانستیی تێدا کۆ دەبێتەوە، ئەویش لە فۆرمێکی تازەدا کە چ فەیلەسوفێکی پێش ئەو پێی نەگەیشت بێت.

ئەم رووکردن و سەمتەی فینۆمۆنۆلۆژیا کارێکی گەورەی کردە سەر فەلسەفەی هاوچەرخ، هەروەها رێڕەوانی توێژینەوەی تایبەت بە هەندێ زانستی مرۆڤایەتیی ئەم کاتە.

مادام فینۆمۆنۆلۆژیا زانستێکی راستی دوورگومانە، رێڕەوێکی هەیە لەسەر شیکاری ماتماتیکی و وەسفی زانستیانە دامەزراوە، مەبەستیشی دەرک کردنە بە بنەما راستەقینەکانی دەرک پێ کراوان،





کەواتە چ گرفتێک نایەتە پێش بەکارهێنانی لە توێژینەوە فەلسەفییەکانی دیکەدا، هەروەها چ گرفتیش نییە کە لە هەندێ زانستی مرۆڤانەدا بەکاری بهێنین بۆ ئەوەی پتر بگەینە رادەی دوورە گومانی تێیاندا.

لەبەر ئەو هۆیانەیە فینۆمۆنۆلۆژیا بازنەی کارکردنی فراوانتر بوو لەو کاتەی لەسەر دەستی هۆسرڵەوە دامەزراوەو لە پاش مردنی و تا ئێستاشی تێدا بێت، زۆر فەیلەسووفی هاوچەرخی چەشنی (ئەلگزەندەر بفاندەر)و (موریس گاریگەر)و (ئەدیت شتاین)و (مارڤن فاریر)و گەلێکی دی کەوتنە بەرکاری، بەڵام (ماکس شیلەر) لەم بارەیەوە لە هەموویان دیارترە کە رێڕەوی فینۆمۆنۆلۆژی لە توێژینەوەی دیاردەی ئاکاریدا بەکار برد. بێ لە چەند فەیلەسوفێکی بواری مرۆڤناسی کە رێڕەوی فینۆمۆنۆلۆژییان لە توێژینەوەی لایەنە جۆر بە جۆرەکانی مرۆڤانەدا بەکار برد، وەکو زمان و بیرکردنەوەو جوانی و مێژوو و هی دیکە، ئەویش وەکو هەوڵێک بۆ سەپاندنی وردی و دوورگومانی لە هەندێ دیاردەی مرۆڤانەدا.

لە دواییدا گەورەترین کارکردنی رێڕەوی فینۆمۆنۆلۆژیا لە فەلسەفەی بوونایەتیی هاوچەرخدا هاتە دی، کە هەندێ لە رابەرانی بوونایەتی ئەم رێڕەوە شیکاریانە وەسفییە نوێیەیان لە رێبازی بوونایەتییەکەیاندا خستە کار، لە پێشەوەی ئەم بوونخوازانەدا (هایدیگەر)و (سارتەر) دێن وەکو دوو قوتابیی دڵسۆزی هۆسرڵ.

# خەملێنی فینۆمۆنۆلۆژیا
# لەسەر دەستی هۆسرڵ

**فینۆمۆنۆلۆژیا چۆن**
**لە بیری هۆسرڵدا دروست بوو؟**
**ئەو قۆناغانەش چین کە بیرو بیرکردنەوەی ئەو پێیاندا**
**تێپەڕیوە تا گەیشتە دوا ئاکامەکانی لە دوارۆژەکانی ژیانیدا؟**

هۆسرڵ سەرەتا خۆمەیلێکی دەروون پەرست بوو، ماتماتیکی سەر بە ئەو خۆمەیلە دەزانی، پاشان ئەو خۆمەیلەییە دەروونی و رووکردنە ئەزموونکارەی رەت کردەوەو لە توێژینەوەکەی دواتری دەربارەی لۆژیک دژایەتیی کرد، دوایی گەییە ئەوەی دەروونزانییەکی نوێ دابنێت، کە بووە سەرەتا بۆ دروست بوونی فینۆمۆنۆلۆژیا، پاشتریش دوا فۆرمی ئەو زانستە نوێیەی لە رووی ئامانج و رێڕەوەوە تەواو کرد.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا کاروانێکی ئایدیالی میتافیزیک (مثالي ميتافيزقي) پەیدا بوو، کە پەیڕەوکەرانی کانتیزمی نوێ






(الكانتية الحديثة) و لە سەرروویانەوە (لیپمان)و (نۆلکێت)و کەسانی دی ئاڵا هەڵگری بوون، ئەویش هاوشانی کاروانێکی ریالیزمی ماتریالانەی زانستی (واقعية مادية علمية) کە رەگ و ریشەکەی دەچووەوە سەر (داروین)و (هیگل)و کەسانی دی، پاشان هەردوو کاروان لێکیان داو کاروانێکی دیکەیان پێک هێنا، کە هەم نێوەند بوو، هەمیش هەردووکیانی تێدا کۆکرابووەوە، زۆربەی رابەرانی ئەم کاروانی سێیەمە لە توێژەرانی دەروونناسی بوون، وەکو (لوتزە)و (فشنەر)و (فونت).

(برنتانۆ)و (ماینونگ)یش هەر درێژەیان بە رێچکەکەی ئەوان دا، ئنجا پاشتر قوتابیی راستەوخۆیان (هۆسرڵ)یش هەر مریدی هەمان رێڕەو بوو.

ئەو بابەتەی خستیانە بەر توێژینەوە، هەوڵێک بوو بۆ یەکالا کردنەوەی گرفتی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان کاری دەرک پێکردن لە لایەک و بابەتە دەرک پێکراوەکان لە لایەکی دیکەوە هەیە، هەروەها روون کردنەوەی چۆنیەتی پێک گەیشتنیان. لەبەر ئەوە توێژینەوەکانیان دەروونزانیی ئەزموونگەری ریالیزم (علم النفس التجريبي الواقعي) و لۆژیکی وێنەیی ئایدیالی (المنطق الصوري المثالي) تێدا کۆکرابووەوە، هەر ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی مێژوونووسان سێیەم کاروانیان ناو نا (دەروونزانیی میتافیزیک) کە هێشتا وێنە ئەزموونگەرەکەی تێدا نەخەملی بوو.

هۆسرڵ و مامۆستاکانی لە سەرەتای ژینی فەلسەفییاندا لە

پەیڕەوکەرانی ئەم ڕێڕەوە بوون، دەروونزانیی ئەزموونگەرانە گەلێ سەرنجی هۆسرلّی ڕاکێشا بوو، پاشان کەوتە توێژینەوەی ماتماتیک بۆ ئەوەی بۆ سەر بنچینانێکی دەروونیی بباتەوە، کە لە نووسینە سەرەتاییەکانی دەربارەی فەلسەفەی ژمارە ڕوونی دەکاتەوەو گەیشتە ئەوەی، کە کارێکی دەروونی هەیەو ئەزموونگەرانە ڕەگەزە تاکەکان یەک دەخات، ناوی کاری (کۆ – لکان / الارتباط الجمعي)ە، کە وا لەو ڕەگەزە تاکانە دەکات بۆ ئەوەی یەک فۆرمی ئاوەزی و ڕوون وەربگرن، بێ پێویست بوونی ڕاڤەی ئاوەزی یا لۆژیکیانە کە ماتماتیکی بۆ بگێڕدرێتەوە.

ئەم ئاکامە سەرەتا بوو لە بیری هۆسرلّ بۆ ئەوەی فەلسەفە بکاتە زانستێکی هەمەکیی ورد (علم كلي دقيق) چەشنی ماتماتیک کە بەشیکردنەوە دەگەڕێتەوە سەر چەند ڕەگەزێکی ئەزموونگەرانە.

بەڵام هۆسرلّ – لە کاتی توێژینەوەی لۆژیکدا – پاشتر کودەتایەکی بەسەر ڕێڕەوی ئەزموونگەرانەی پێشیندا کرد، دیتی کەوا شیکردنەوەی ماتماتیک هەروەها شیکردنەوەی بناغە دەروونییەکانی تایبەت بە ئەو، لە کۆتاییدا دەگەڕێنەوە سەر زانستی لۆژیک و کەوتە ڕەخنە گرتن لە هەموو شتێکی ئەزموونگەری ماددی، چونکە بە ناچاری هەندەکی (جزئي) و بگۆڕ(متغير)ن و، ناگونجێن بۆ دامەزراندنی زانستێکی دوورگومانی نوێ، کە بشێ وەکو بناغە بۆ هەموو زانست و زانینەکانی مرۆڤایەتی. ئەم شتەش یەکەم: ئەوەی لێ خواست کە دەروونزانیی ئەزموونگەرانە چاک بکاتەوە، هەروەها





لۆژیکی کۆنی وێنەیە (المنطق الصوري القديم)یش چاک بکاتەوە، بۆ ئەوەی دوو زانستی نوێیان لێوە هەڵبهێنجێ و لەسەر ئەوانیش پاشتر زانستی هەمەکیانەی دوورگومانی (فینۆمۆنۆلۆژیا) دابمەزرێنێ.

لەبەر هەموو ئەمانە هۆسرلّ کەوتە هێرش کردنە سەر دەروونزانیی ئەزموونگەرانەو ڕەخنە لێ گرتنی، چونکە لە ڕووداوی هەندەکی و بگۆڕ دەکۆڵێتەوەو، دەروونزانییەکی لە بریدا، کە بنچینەکەی (کاری کردە)– (کاری مەبەستدار) بێت، دامەزراند، کە واتای ئەوە دەگەیەنێت، (هەست) مەبەستی بابەتەکەی دەبێت بۆ دەرک پێکردنی، بە هۆی ئەو کارەوە بڕیاری دا کە هەستی ڕووت (الشعور المجرد) نییە، چونکە هەست خۆی لە خۆیدا هەست کردنە بە شتێک و نەک هەستێکی بۆش و بەتاڵ.

ئەوەیە دەروونزانیی مەبەستدار، یا دەروونزانیی فینۆمۆنۆلۆژی کە هۆسرلّ دایمەزراندووە. لە هەمان کاتدا لۆژیکی وێنەیی گۆڕی و کردییە لۆژیکی بالاّچوو (المنطق المتعالي)، تێیدا پێوەری و واقیعی (المعياري و الواقعي) هیچ جیاواز نین، بەڵکو لە گەوهەردا هزرێکی هەمەکی و بنەماگەلێکی ڕووتە. لە کۆتایی ئەم چاک کردنەدا دەبینین هۆسرلّ دەست بە دامەزراندنی فینۆمۆنۆلۆژیا دەکات لە دوا فۆرمیدا وەکو زانستێکی هەمەکیی وەسفانەی دوورگومان (علم وصفي كلي يقيني).

## پێناسەکردنی فینۆمۆنۆلۆژیاو ڕێڕەوە وەسفکارەکەی

هۆسرڵ گەلێ پێناسەی بۆ فینۆمۆنۆلۆژیا دانا، پوختەکەیان ئەوەیە کە فینۆمۆنۆلۆژیا زانستێکی هەمەکیی سەراپاگیر (كلي شامل)و ڕێڕەوێکی فەلسەفیی وەسفکارانەی نوێیە، یەکەم فەلسەفەیە ئامانجی ئیدراک کردنی بنەماکانە لە نێو هەستدا و، دانانی بناغە گشتییەکانی هەموو زانین و زانستەکان بە تایبەت زانستە بەرتواناکان (الممكنە)ی کە فینۆمۆنۆلۆژیا وەکو زانستێکی هەمەکی یا ڕێڕەوێکی سەراپاگیری زانین لێیەوە دەست پێدەکات.

بەڵام ئایا خاڵی سەرەتاو دەست پێکردن لە لای هۆسرڵ بۆ دامەزراندنی ئەم زانستە چییە؟ ئایا لە هەڵوەستی سروشتییەوە دەست پێدەکات بۆ ئەوەی ریالیست بێت، یان لە هەڵوەستی خودییەوە بۆ ئەوەی ببێتە ئایدیالیست؟

هۆسرڵ لە هەڵوێستدا ریالیست بوون و ئایدیالیست بوونی خۆی رەت کردەوە، بەڵکو وای ویست کە فینۆمۆنۆلۆژیا هەردووکیان دە ئامێز بگرێت و لە جیاوازی کردنی نێوانیان بالاتر بێت و، گونجاوی لە نێوانیاندا لە یەک مەیان کە مەیانی هەستە، هاتە کایەوە. چونکە ئەرکی فینۆمۆنۆلۆژیا تەنها وەسف کردنی کرداری ئیدراکە، دیسان شیکردنەوەی هەست بۆ دۆزینەوەی ئەو بنەما گشتییانەی تێیدا حەشار دراون، کە هەموو زانست و زانینمانی لەسەر دامەزراوە، بەوە فینۆمۆنۆلۆژیا دەبێتە زانستێکی هەمەکیی سەراپاگیرو بناغەیەکی





بنچینەیی دوورگومان بۆ زانستەکانی دیکە.

بۆ بەجێ هێنانی هەموو ئەمانە هۆسرڵ یەکەم: هەستا بە گێڕانەوەی جیهانی دەرەکی لە وێنە سروشتییەکەیدا بۆ خود یا بۆ (ئەز) کە لە راستییەکەیدا هەست دەنوێنێ، ئەمەشی ناو نا (کرداری زڤڕاندن) (الفعل الارجاعي) و کردییە دوو جۆر: زڤڕاندنێکی بنەمایی کە رووداوە هەندەکی و ماتریاڵییەکانی شتانی تێدا فەرامۆش دەکەین و، تەنها بە هەڵهێنجانی بنەما هەمەکییەکەی دەوەستین. پاشان زڤڕاندنێکی بالاچوو کە تێیدا حوکمدان بەسەر شتە ماددییە دەرەکییەکان راگیر دەکەین بۆ کاتی پشکنینی بنەماکەیان و دەست نیشان کردنی واتاکانیان، هەروەها راگرتنی حوکمدان لای هۆسرڵ وا دەگەیەنێ گێتی لە نێو دوو کەواندا دابنێین بە شێوەیەکی کاتی، تا وەکو دیاردەیەکی رووتی بەرقەرار، بە هۆی هەستەوە لە بنەماکەی دەکۆڵینەوەو پێویستی بە گەلێ واتا دەبێت کە (ئەز) دەیخاتە پاڵییەوە.

ئەز – لە پاش زڤڕاندنەکەی پێشوو – کرداری وەسف کردنی ئەو بەرهەستانە (المدركات) وەکو کە لە هەستدان ئەنجام دەدات، بێ ئەوەی لە وێنەیەکی شێوەییدا رێکیان بخات، کە نەگونجێ لەگەڵ راستیی واقیعیانەیاندا، هەروەها ئەزیش هەست و بەرهەستەکانی هەست شیدەکاتەوە بۆ دەرک کردنی بنەما تێدا شاردراوەکانی.

لە کاتی ئەو کرداری وەسف کردن و شیکردنەوەیەدا دەبینین کەوا هەست هەردەم لە ئاراستەو هەمیشە مەبەست بە جیهانی دەرەکییە بۆ

دەرک پێ کردنی، چونکە بێ دەرک کردنی ئەو شتە دەرەکیانە، هەست کردن بە هیچ شێوەیەک مومکین نابێت، چونکە وەکو کە ناویشی وایە، هەست خۆی لە خۆیدا هەست کردنە بە شتێک لە شتان، هەستی رووت (مجرد)یش چ بوونێکی نییە. لە هەمان کاتیشدا ئەو شتە دەرەکییە سروشتییانە دەبینین بە تەنها هیچ جۆرە واتایەکیان نییە تەنها مەگەر بە هۆی هەستەوە، کە دەرکیان پێ کراو بنەماکانیان هەڵبهێنجرێن و بەهۆی ئەزەوە واتای جۆراوجۆریان پێ ببەخشرێت.

هەمیشە چوونی هەست بەرەو دەرک پێ کردنی شتان، پاشان ئامادەگی شتان و شیانیان بۆ کەوتنە بەر پرۆسەی دەرک کردن، ئەم کردارە پێکەوە لکاوە، کە هۆسرڵ زاراوەی (ئاراستەی ئاڵوگۆڕی) پێ دەڵێت یا (بیرۆکەی مەبەستێتی)، کە بە هۆیانەوە بنەما هەمەکییەکان لە هەستدا مەزەندە دەکرێن.

لە پاش کرداری مەزەندە (حدس)وە دووبارە دەگەڕێینەوە بۆ جیهانی دەرەکی، کە پێشتر حوکم بەسەردا کردنەکەیمان راگرت بوو، بۆ ئەوەی دوو کەوانەکە لابەرین و واتا راستییەکانی، کە لە بنەماکانی پێشوو هەڵمان هێنجاون، بیان خەینە پاڵی، ئەوسا جیهان دێتە ئیدراک کردن و واتای دێتە تێگەیشتن. بە پێچەوانەی ئەوەی کە بە پەرپووتی و بێ شیکردنەوە باسی بکەین، هەروەها کە وەکو گشتێک دەرکی پێ بکەین و بێ ئەوەی تایبەتمەندیی بنەماکەشی دەست نیشان بکەین.

دەرک پێ کردنی ئەو بنەما رووت و رەوانانە گەوهەری زانستی هەمەکیانەی دوورگومان دەنوێنێ بەو چەشنەی هۆسرڵ هەوڵی





دامەزراندنی دا، بەوەی فەلسەفە بە توێژینەوەی وەسفکارانەی شیکاریی ئەو بنەما رووتانە دەبێتە یەکەم بناغە بۆ هەموو زانینەکانمان، چونکە زانستی هەمەکیانەی سەراپاگیرە بۆ هەموو زانستە بەرتواناکانی (العلوم الممکنة) دیکە.

## بوونایەتی
## هۆکار و بارودۆخی هاتنەکایەی بوونایەتی

تەشــەنە کــردنی ڕێڕەوی مــاتریالانەی ئەزمــوونگەرو زاڵبــوونی هزربیـانەی توندو تیژە، بووە هۆی بەرپابوونی دژە کاردانەوەیەک، کە ڕەوتی گـیـانیی هاوچەرخ (الاتجـاه الروحي المعـاصر) نوێنەرایەتیی کرد.

هەمـان شت جـارێکی دیکە دووبارە بووەوە کـاتێک چێـوەی شیکاری ماتماتیکی و ئەزموونگەری زانستـیـانە فراوان بوو، ڕەگ و ڕیشەیان بەرەو هەموو بوارەکانی پێکهاتەی مرۆڤایەتی چوو، ئەم کارە بووە مایەی ڕەش کردنەوەی بنچینە مرۆڤایەتییەکەی مرۆڤی زیندوو و فەوتاندنی خەسڵـەتی چالاکـانەی کە - لە ڕوانگەی هەندێکەوە - نابێ بخـرێتـە ژێر باری شـیکردنەوەی مـاتماتیـکانەی وێنەییـەوە، هەروەها ملکەچی ئەزموونی میکانیکیانەی زانستیش نابێت، چونکە مـرۆڤ لە گـەوهەردا دۆخـێکی مـرۆڤـانەی پەرەسـەندووە، هەروەها





ئەزمـوونی مـرۆڤـانە لە ڕاستـەقـینەدا وشک هەڵاتوو نـیـیـە چەشنی سروشت، بەڵکو ئەزموونێکی بزواو و زیندووە، کە تایبەتمەندیی تەواو جـودای هەیە بەرانبـەر دیاردەکـانی دیکە، لەبەر ئەوە بەکـارهێنانی توێژینەوەی زانســتی لە لێکۆڵـینەوەی مــرۆڤــدا بە ناچاری ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ دەبێتە تەنها ئامێرێک یا هەر شتێکی دیکە، نەک مرۆڤ.

بە ڕاسـتی زانست بە سـوودەو مـاتماتیکیش گـەلێ سـوودبەخـشـە، بەڵام بە مەرجێک گەوهەرە چالاکەکەی مرۆڤ ڕانەماڵێت، چونکە ئەم شـتـە گـەلێ فـەیلەسـووفی هاوچەرخی بەرەو بەرپاکـردنی شـۆڕش برد بەسەر ئەو ڕێڕەوە بیرکاری و زانستیانەی پێشوو، هەوڵی ڕزگارکردنی مرۆڤیان دا لە کۆتەکانیـان، پاشان لێکۆڵینەوەی ئەزموونی مرۆڤایەتی بەپێی گونجانی لەگەڵ سروشتە ڕاستەقینەکەی خۆیداو، زڤڕین بەرەو بوونی زیندووی مـرۆڤـانە لە واقـیـعـە بە پیت و پەرەسـەندووەکەیدا، لەبەر ئەوە بوو کە ئەم ڕێڕەوە مرۆڤایەتییە نوێیە بەم دروشمە نوێ و بنچینەییەی سەری هەڵدا، (زڤڕین بەرەو مرۆڤ).

هەروەها ڕابەرانی ئەم ڕێڕەوە هەوڵی تێگەیشـتنی دنیـای ناوەوەی مرۆڤیان دەدا، بە تایبەتی لە پاش ئاشکرا کردنی تیۆرییەکانی نەست (هەستی نائاگا) لە لایەن فرۆیدەوە، کە ڕۆڵێکی گـەورەی لە ژیان و ڕەفتاری تاکە کەسدا گێڕا، لەبەر ئەوە چاکتر وایە مرۆڤ بەردەوام بێت لە دۆزینەوەی بوونی مرۆڤانەی خۆی و پێکهێنەرە پەرەسەندووەکانی کە بنچینەی جۆری ڕەفتارەکانیەتی.

فرۆید ڕێگای بۆ دۆزینەوەی ڕاستیی ناوەوەی مرۆڤ کردەوە، پاشتریش چەندین هزرەوەرو فەیلەسووف لەسەر هەمان سەمت و ڕێڕەو ڕۆیشتن بەڵام بە جۆرە شێوازێکی دیکە، ئەویش لە هەوڵەکەیاندا بۆ دووپات کردنەوەی جیاوازیی مرۆڤی زیندوو بەرانبەر بە سروشتی وشک هەڵاتوو، هەروەها ئاشکرا کردنی توانا بێ کۆتاکانی ئەزموونی مرۆڤانە، کە پێشتر کەس لەبەر سەرسام بوون بە زانستی ئەزموونگەرانەی وابەستە بە ماتماتیکی شیکارانە، سەرنجی لێنەدا بوو، هەروەها بە هەڵە باوەڕ کردن بەوەی توانای جێبەجێ کردنی هەموو ئەمانە لە کاتی توێژینەوەی لە مرۆڤ و ئەزموونە هەستییەکانی بە هەموو ئەو فراوانی و چالاکییەی کە هەیەتی.

مرۆڤ هەر مرۆڤە نەک سروشت، جیاوازییەکانیش - لەگەڵ هەبوونی ڕەگەزی وێک چوونیش - گەوهەرین، بەڵام لە کۆتاییدا سروشت وشک هەڵاتووەو مرۆڤیش زیندوو، لەبەر ئەوە پێویستە فەیلەسووفەکان سەر لە نوێ بڕواننەوە مرۆڤ بۆ پاراستنی مرۆڤایەتییەکەی، کە ناکرێ نکوولیی لێ بکرێت و هەرگیز ڕاستییەکەشی پشت گوێ ناخرێت.

هەروەها لەو هۆیانەی، کە ڕێی پەیدابوونی ڕەوتی مرۆڤانە خۆش کرد، شۆڕشەکەی فەیلەسووف و هزرەوەرو زاناکان بوو دژ بە (ڕەها)ی باو لە سەدەی نۆزدەهەمدا، نیوتن بناغەی ڕەهاییی لە زانستدا دانا، باری ئەم بناغەیەش لە فەلسەفەدا ڕەنگی دایەوە، جا ڕاستەقینە بووە شتێکی ڕەها، هەروەکو پێشتر (کانت) ڕایگەیاند بوو (هیگل)یش



وەکو ناودارترین ئایدیالیستی دوای ئەو، درێژەی پێدا، مرۆڤی ڕاستی لە لای ئەوان مرۆڤی هەمەکییە (الانسان الکلی) کە بنەماکەی لە ئاوەزی تیۆریدا دەردەکەوێت، بەڵام هەندەکییەکانی ئەو مرۆڤە ڕەهایە کە لە (کاوە)و (کارزان)و (دلێر)دا وەکو کەسانێک دەنوێ و دەرکەوتنی بگۆڕی ڕاستەقینە هەمەکییەکەن، ئەم بوونە تاکە بگۆڕو هەندەکییە چ بەهایەکی ئەوتۆی نییە.

ئەم ڕێڕەوە ئایدیالییە ڕەهایە بووە هۆی لەناودانی تاکێتیی مرۆڤ و لەناودانی ڕاستیی دیاری کراوی و بوونی واقیعانەی ژینی، لەگەڵ فەرامۆش کردنی ئەزموونە تاک و زیندووەکانی، کە ڕاستییە مرۆڤایەتییەکەی بە بەرچاوی دەنوێنیت. لەبەر ئەوە فەیلەسووفە هاوچەرخەکان شۆڕشیان دژ بە بیرۆکەی ڕەها بەرپا کردو ئایدیالیستییشیان ڕەت کردەوە، بەوەی بوونی مرۆڤی تاکی بەبێ بەها دانا بوو، لەگەڵ ئەوەی کە یەکە ڕووداوی ڕاستەقینەو بەرهەست دەنوێنێت و بوونی مرۆڤانەی دووپات دەکاتەوە، فەیلەسووفی بوونایەتیی دانیمارکی (کیرککگورد)[*] یەکەم کەس بوو کە سەرنجی ئەو ڕاستییەی دا، دژ بە ئایدیالیزمە ڕەهاکەی (هیگل)یش وەستاو یەکەم بەردی بناغەی دانا، کە پاشتر فەیلەسووفانی بوونایەتی درێژەیان پێدا، مەبەست گەڕانەوەی بوو بۆ ئەزموونی مرۆڤانەی تاکی زیندوو، بەوەی خودی سەربەخۆو کارایە بە چەشنێکی بێ وێنە لەنێو

(*) سۆرین کیرکگورد (کیرکغارد - Kierkegaard/ ١٨١٣-١٨٥٥) فەیلەسووف و لاهووتناس و بوونخوازێکی دانیمارکییە، بوونەوەری بە جۆرێک لە ڕەشبینی ڕاڤە کردووە.

زیندەوەرانی دیکەدا.

بێ لە هۆکارەکانی رابردووی پەیدابوونی ڕێڕەوی مرۆڤانەی بوونایەتی، وەکو دەڕوانین بارودۆخی کۆمەڵگای ئەوروپا بە تایبەت لە سەدەی بیستەمدا، هۆیەکی دیکە پێک دەهێنێت. ئەوروپا بە دوو شەڕی جیهانیی خاپوورکەردا تێپەڕی، ئاکامەکانی بە سەرکەوتنی هەندێک و ژێرکەوتنی هەندێکی دی کەوتەوە، گرفتی ژیانی مرۆڤ و چارەنووسی بووە بواری تێرامانی فەیلەسووفان و هەوڵەکانیان بۆ دۆزینەوەی چارەسازییەکان. هەروەها شەڕو کۆلۆنیال کردن لەگەڵ داگیرکردن و چەوساندنەوە هەمووی بووە هۆی پەیدابوونی گرفتی ئازادیی مرۆڤی تاک و پەیوەندیی بە کەسانی دیکەوە، لەبەر ئەوە فەیلەسووفان کەوتنە گفتوگۆ کردن لەسەر مەسەلەی بەرپرسیاریی مرۆڤی تاک، پاشان گفتوگۆ کردنی ئەو ڕاڕاییەی وابەستە بەو بەرپرسیارییەی لە دەروونی ئەوروپاییانی هاوچەرخدا لە ئاکامی شەڕو وێرانکاریدا، پەیدا بوو.

بەم شێوەیە دەبینین ئەو بارودۆخە بیری ئەوروپیی بە گشتی بەرەو توێژینەوەی گرفتەکانی مرۆڤ برد - بە تایبەتی ئازادی و بەرپرسیارێتی - لە فۆرمێکی نوێ و گونجاو لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا، پاشتریش ڕێڕەوی بوونایەتیی مۆرک مرۆڤانە پەیدا بوو، کە فەیلەسووفان خۆیان بۆ توێژینەوەی ئەو گرفتانە تەرخان کرد، هەروەها نیشاندانی ڕۆڵی مرۆڤی تاک لە ڕووداوەکانی سەدەی بیستەمدا.





## ناودارانی فەلسەفەی بوونایەتی و ڕێڕەوەکانیان

ئەم ڕێڕەوە مرۆڤایەتییە نوێیە لەو ڕێبازە فەلسەفییە بوونایەتیانەدا بەدیار کەوت کە لە سەدەی بیستەمدا سەریان هەڵدا، شۆڕشەکەی (کیرککگورد) بەسەر ئایدیالیزمە رەهاکەی (هیگل)و ئەو هەوڵەی لە پیناو بەهای بوونی مرۆڤانەی تاک و روون کردنەوەی ئەو ئەزموونە بوونایەتییە زیندووانەی (التجارب الوجودية الحية) کە تاک تێیاندا دەژێت. زۆر فەیلەسووفی هاوچەرخ درێژەیان بەو شۆڕشە بوونایەتییە دا هەر لە نێو ئەو رەوتەی کە (سۆرین کیرککگورد) لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە شۆڕشەکەی دژ بە ئایدیالیستە ڕەهاکەی هیگل بۆ سەلماندنی بوونی تاکێتی خۆی تۆوەکەی دابوو، بەڵام فەلسەفەکەی لە زەمینەی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕێی نەشونما کردنی بۆ نەڕەخسا، لەبەر ئەوە هەر بە شاراوەیی مایەوە تا فەیلەسووفانی سەدەی بیستەم هاتن و دووبارە دۆزییانەوەو، لەو شۆڕشەوە کاروانە فەلسەفییەکەیان دەستی پێ کرد، بەڵام لە ڕێدا جیاوازییان کەوتە نێوان و بە کووچەکاندا بڵاوەیان لێ کرد، ڕەوتێکی بوونایەتیی ئەڵمانی پەیدا بوو، کە (مارتن هایدگر)و(*) (کارڵ یاسپەرز)(**) ئاڵا هەڵگری

---

(*) مارتن هایدگر (هایدغر - Heidegger/ ١٨٨٩-١٩٧٦) فەیلەسووفێکی ئەڵمانییەو یەکێکە لە دامەزرێنەرانی بوونایەتی.

(**) کارڵ یاسپەرز (یاسبرس - Jaspers/ ١٨٨٣-١٩٦٩) فەیلەسووفێکی ئەڵمانییەو گەورەترین فەیلەسووفی بوونایەتیی مەسیحییە.

بوون، هەروەها ڕەوتێکی بوونایەتیی[*] فەرەنسی پەیدا بوو، کە (جان پوول سارتەر)و (گابریل مارسیل)و (موریس مارلو بونتێ) ئاڵا هەڵگری بوون.

قوتابخانەی بوونایەتیی فەرەنسا ڕۆڵێکی گەورەی لەنێو فەرەنسادا گێڕا، کە ڕێبازێکی فەلسەفیی نوێش بە ناوی (ڕێبازی کەسایەتی) (المذهب الشخصي)یەوە لەسەر دەستی (ئیمانۆیل مونییێ) دامەزراو فەیلەسووفانی هاوچەرخی دیکە درێژەیان پێدا، ئەویش لە بنەڕەتدا درێژە پێدانی بوونایەتی بوو.

(جان پوول سارتەر) بە ناودارترین فەیلەسووفی بوونایەتیی هاوچەرخ لە هەموو گێتیدا دێتە پێش چاو، چونکە چالاکیی هزریی ئەو تەنها لە فەلسەفەی ڕووت (الفلسفة المجردة)دا نەگیرسایەوە بەڵکو وێژەو شانۆ، هونەرو ڕامیاریشی گرتەوە، بێ لەوەی چەشنی فەیلەسووفی شیکارایەتی (برتراند ڕاسڵ) ئاشتیخوازێکی جیهانییش بوو.

فەیلەسووفانی بوونایەتی لە ڕێڕەوێک گەڕان بەکاری بهێنن بۆ توێژینەوە لە مرۆڤ بەوەی کە دیاردەیەکی زیندووە، شتێکی ئاسایی بوو کە ڕێڕەوی ئەزموونگەری و ڕێڕەوی شیکاری بیرکارانە (التحليل الرياضي) ڕەت بکەنەوە، وای بۆ چوون کە ڕێڕەوی فینۆمۆنۆلۆژی کە پێشتر (هۆسرڵ) دایمەزراند بوو زیاتر لە هەموو ڕێڕەوێکی دیکە لە

(*) گابریل مارسیل (مارسیل – Marcel/ ١٨٨٩-١٩٧٣) فەیلەسووفێکی فەرەنسییە، یەکێکە لە فەیلەسووفانی ڕەوتی مەسیحی لەنێو بوونایەتیدا.



ڕوانینی ئەوانەوە نزیکە، لە پێناو ڕێ خۆش کردن بۆ توێژینەوە لە مرۆڤ و گێتی بە هۆی فینۆمۆنۆلۆژیاوە، بەڵام (هۆسرڵ) تەنها ڕێڕەوەکەی داناو پێکهاتەکانی کاری هەستیانەی مەبەستداری (الحسي القصدي) دۆزییەوە بەبێ ئەوەی پراکتیکیان بکات، چونکە جیهانی بە شێوەیەکی کاتی خستە نێو دوو کەوانەوەو، حوکمدان لە بارەیەوەی دواخست تا ئەرکەکەی پێشین ئەنجام دەدات، دواتر دێتە سەر لادانی جووتە کەوانەکەو دەست بە حوکمدان لە بارەیەوە دەکات.

بەڵام (هۆسرڵ) ئەم هەنگاوەی نەنا کە دواتر بوونخوازەکان ئەنجامیان دا، گەڕانەوە سەر بوونی هەڵواسراوی پێشوو بۆ لێ توێژینەوەی وەکو دیاردەگەلێکی هەستی و ئەزموونانێکی زیندوو لە ژیانی مرۆڤدا، لەوەشدا ڕێڕەوی فینۆمۆنۆلۆژیایان بەکار برد، کە بە ڕوونی لە فەلسەفەکەی (هایدگر)و (سارتەر)و (بونتێ) دیار بوو، گەرچی هەندێکیان وەکو (سارتەر) لە دوا دوایی فەلسەفەکەیاندا بەرەو ڕێڕەوی دیالیکتیک چوون، ئەویش لەپاش گونجاندنی لەگەڵ سروشتی زیندووی مرۆڤانەدا.





## پوختەی ڕاکانی
## سارتەر لە بارەی بوونایەتییەوە

باشە ئێستا سارتەر(*) مەبەستی چییە لە بوونایەتی؟ لەبەر چیشە کە دەڵێ فەلسەفەیەکی مرۆڤانەیە؟

سارتەر بوونی کرداریانەی شت لە لایەکەوە بەرانبەر بە بنەما (ماهیەت)، یا کۆمەڵە سیفاتە گەوهەرییەکانی ئەو شتە لە لایەکی دیکەوە، دادەنێ، بەوەی کە هەردووکیان واقیعیانە پێکەوە لکاون، بەڵام دەشپرسێ: کامیان پێش کامیان کەوتووە؟ شتەکان هەن یا نین کە پاشتر بنەماو سیفاتەکانیان دروست دەبن؟ یاخود بنەماو سیفاتەکان پێش بوونی خودی شتان هەن؟ سارتەر وای وەڵام دایەوە کە شتە بێگیان و دروست کراوەکان بنەماکانیان پێش بوونیان لە کایەدان، بە نموونەش هێنانە کایەی چەقۆ یا کتێبێک دێنێتەوە، دروستکەر لە هزریدا بنەمای ئەو شتەی دیاری کردووە، هەروەکو سیفاتە گەوهەرییەکانی لە ئاوەزیدا دەنوێن و بە پەیڕەو کردنی ئەم دیاری کردنەی سیفاتەکان، ئەو شتە هاتووەتە کایەی بوونەوە، بەم چەشنە لێرەدا بنەما پێش بوون کەوتووە، هەر ئەویشە وای لە شتەکە کردووە کە بێتە واقیعەوە، ئەو شتەش پاشتر ناتوانێت هیچ بنەما یا سیفاتی نوێ بداتە پاڵ خۆی. بەڵام مرۆڤ تەنیا بوونەوەرێکی ئاوەزدارە (کائن عاقل) کە بوونەکەی پێش بنەماکەی کەوتووە، بەمەش لەگەڵ تیۆری فەیلەسووفە ئایدیالیستەکانی سەدە پێشینەکاندا یەک ناگرێتەوە، بە تایبەتی (دیکارت)(*) کە بڕیاری ئەوەی داوە، سیفات و بنەماکانی مرۆڤ لە (ئاوەزی یەزدان)دا هەبوون و پاشتر بەم جۆرە مرۆڤی دروست کرد.

سارتەر ئەم پێش هاتنی بنەما (الماهیة) بەسەر بووندا ڕەت دەکاتەوە، چونکە وای دیت کە ئازادیی مرۆڤ زەوت دەکرێت و هەموو سیفاتێکی پێشتر دیاری دەکرێ، بەم شێوەیە مرۆڤ ناتوانێ لێی دەرباز بێت یاخود ڕاستیان بکاتەوە، هەروەها بۆ ئەوە چوو ئەم قسەیەی پێشوو مرۆڤ دەخاتە ژێر باری ناچارایەتی (الجبریة)یەوە، هەرچی ئەویشە، ئازادیی بۆ مرۆڤ دەوێت لەپاڵ توانای هەڵبژاردنی سیفاتەکانی هەروەکو خۆی دەیەوێت، لەبەر ئەوە بڕیاری دا کە بوونی مرۆڤ پێش بنەماکەی دەکەوێت، مرۆڤ لە سەرچاوەیەکەوە فڕێ درایە ژیانەوەو سارتەر گفتوگۆی ئەو سەرچاوەیە ناکات بەڵکو بە شتێکی بەڵگە نەویستی بنچینەیی داناو لە پاش هاتنە کایەی مرۆڤەوە، مرۆڤ هەر خۆی کەوتە دروست کردنی بنەماکەی و دیاری کردنی سیفاتەکانی بەو شێوەیەی کە خۆی مەبەستیەتی، بە واتایەکی دی مرۆڤ لە پاش هاتنە کایەی ئەوجا کەوتە دروست کردنی خۆی و دامەزراندنی خودی بە سەربەستییەکی تەواوەوە، چونکە هەر ئەم کارەیە مرۆڤ لە بوونەوەرانی دیکەو زیندەوەرانی دی جودا دەکاتەوە.

(*) جان پوول سارتەر (سارتر- Sarter/ ١٩٠٥-١٩٨٠) فەیلەسووف و نووسەرو ڕەخنەگرێکی فەرەنسییە، کەوتە بەر کاریگەریی دیاردایەتییەکەی هۆسرڵ و هایدگر، پێشەنگی بوونایەتیی ڕەشبینەو پێی وایە بوون پێش ماهیەت (بنەما) کەوتووە.

(*) رینێ دیکارت (دیکارت - Descartes/ ١٥٩٠-١٦٥٠) فەیلەسووف و زانایەکی ماتماتیک و فیزیکی فەرەنسییە سنووری فەلسەفەی کۆنی شکاندو دامەزرێنەری ڕێبازی ئەقڵانیزمەو خاوەنی گوتەی (من بیر دەکەمەوە کەواتە هەم).






مادام کە بوون پێش بنەمایەو پاشتر مرۆڤ دەست بە دروست کردنی خۆی و دامەزراندنی خودی دەکات، لەبەر ئەوە سارتەر بڕیاری دا کەوا مرۆڤ لە بنچینەی بوونەکەیدا تەنها پرۆژەیەکەو بەس، هەر خۆی بەخۆی بنەماو سیفات و ئەو تایبەتمەندییانەی کە دەیەوێت بۆ خۆی و لە ژیاندا هەوڵی ئەنجام دانیان دەدات، دیارییان دەکات، وەکو ئەوەی بیەوێ ئازا بێت یا ترسنۆک، زانا بێت یا نەزان، چاک بێت یا خراپ، بە ژن بێت یا بێ ژن، بەم شێوەیە لەگەڵ هەموو ئەو سیفاتانەی تایبەت بە خۆی. کەواتە پێشکەوتنی بوون بەسەر بنەمادا بە ناچاری ئەوە دەگەیەنێت، مرۆڤ لە ژیان و لە هەڵبژاردنی سیفاتەکانیدا ئازادە، ئەو ئازادییەش مرۆڤایەتیی مرۆڤ دەسەلمێنێ.

هەڵبژاردنەکەش لێرەدا بە رەهایی بۆ تاکە کەس نییە، بەڵکو سارتەر بڕیاری ئەوە دەدات، کە کاتێک تاکە کەس هەڵبژێرێ دەبێ ئەوەی لە بیر بێت کە هەموو مرۆڤایەتی پەیوەستە بەو هەڵبژاردنەوە، نەک تەنها خۆی هەڵبژاردنەکە ئەنجام بدات، لەبەر ئەوە کارەکە وا لە تاکە کەسی مرۆڤ دەکات، ئەو سیفاتانە هەڵبژێرێت کە سوودی خۆی و کەسانی تریشی تێدایەو خۆی و هەمووان پەسندی دەکەن، لەبەر ئەوە ئەو هەڵبژاردنە بووە بەرپرسییەکی گەورە لە ئەستۆی ئەو تاکە کەسەی، کە هەر خۆی دادەڕێژێ، چونکە لە هەمان کاتدا بە گشتی نەخشەی مرۆڤایەتیش دەکێشێ.

ئەم بەرپرسییە گەورەیە هەستی ڕاڕایی لە کاتی هەڵبژاردنەکەدا لە لای تاکە کەس دەخولقێنێ، ئەم ڕاڕاییە رووخێنەر نییە، بەڵکو وا لە



کەس دەکات چاک ئەو سیفاتانە هەڵبژێرێت، کە خۆی و هەموو کەسانی مرۆڤایەتی پەیڕەوی دەکەن. لەبەر ئەوە ئەرکی سەر مرۆڤ لەم هەڵبژاردنەدا ئەوەیە، لە خۆڕا هەڵوێستە مرۆڤایەتی و سیفاتە سوود بەخشەکانی کارگەر لە پێشکەوتنی کۆمەڵی مرۆڤدا هەڵبژێرێت.

ئێستاش لە توانادایە کە پوختەی راکانی سارتەر لە چەند پەیڤێکدا کۆ بکەینەوە: لەبەر ئەوەی بوونی مرۆڤ پێش بنەماکانی کەوتووە، کەواتە مرۆڤ لە هەڵبژاردنی سیفات و تایبەتمەندییەکانیدا ئازادە، بەڵام لەو هەڵبژاردنەدا دەبێ (مولتەزیم)و پەیوەستدار بێت، چونکە هەڵبژاردنەکە بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، جا لێرەڕا دەبینین ئازادی و هەڵبژاردنەکە لکاون بە هەست بە بەرپرسایەتی و بە ئەو ڕاڕاییەی کە ئامانجی بنیادنان و کارکردنە، بەم شێوەیە دەبینین مرۆڤ بە ئازادییەوە بەستراوەتەوە، هەروەها بەو ئاکامانەی کە ناتوانێت بە هیچ شێوەیەک لێیان دەرباز بێت.

بەپێی ئەو سەمت و رووکردنەی پێشوو لە ئازادیدا، دەبینین سارتەر بوون دەکاتە سێ جۆری بنەڕەتی، یەکەم: بوون لە خوددا، بوونی شتان و جیهانی ماتریاڵ، دیاردەکانی پێوەلکاویان دەگرێتەوە، ئەم بوونە نابۆش و پڕە، هەروەها بوونێکە هەرگیز بنەما پێشی ناکەوێت. دووەم: بوون بۆ خودەکەی، ئەمەش هەستی زیندوو یان خود یان مرۆڤ بە گشتی دەگرێتەوە، هەست کردنێکە بە کەمی، هەمیشە خاوەنەکەی هەوڵی پڕکردنەوەو بنیادنانی بنەماکەی دەدات. سێیەم: بوون بۆ غەیرەز، هەمان هەست کردنە خۆییەکەی پێشووە بەڵام بە





لکانی به کەسانی دیکەوە، چونکە خود بە تەنها نییە لەم گێتییەدا، بەڵکو بە رایەڵێک پەیوەندیی زۆرەوە بە کەسانی دی پەیوەنددارە، کێشەیەکی بەردەوامیش لە نێوان بوون بۆ خودو، بوون بۆ غەریزەدا هەیە، دووەم هەوڵی راکێشانی یەکەم دەدات بۆ بواری کەسانی دی، هەرچی خودیشە هەوڵی گێڕانەوەی خودییەکەی دەدات لە بەرانبەرەکەی.

ئەمە بوو پوختەی بیرو راکانی سارتەر کە بایەخی دا بە لێ توێژینەوەیان لەسەر ڕێڕەوی فینۆمۆنۆلۆژی، بەڵام لە کۆتایی ساڵەکانی ژیانیدا، ساڵی ١٩٦٠ وەرچەرخا بەرەو ڕێڕەوی دیالیکتیک بۆ توێژینەوە لە بوونی مرۆڤانەدا، ئەویش لە کتێبە گەورەکەیدا (رەخنەگرتن لە ئاوەزی دیالیکتیکی) وەدەر دەکەوێت، سارتەر لە سەرەتای ژیانی فەلسەفییدا بە گشتی هێرشی دەبردە سەر مارکسیزم، چ وەکو ڕێڕەو یا ناوەڕۆک و فەلسەفەکەی، ئەویش لەبەر باوەڕبوونی بەوەی کە ناگاتە ئاستی تێگەیشتن لە راستیی مرۆڤایەتی و لە کاروانی پەرەسەندنی بیری مرۆڤایەتیش وەدوا کەوتووە، هەر لە ساڵی ١٩٦٠ەوە سارتەر هەوڵی چاککردنی مارکسیزمی دا وەکو رێ خۆش کردنێک بۆ لێکدانی لەگەڵ بوونایەتییەکەیدا بۆ دروست کردنی یەکەیەکی تۆکمەو پتەو.

سارتەر بەوەی مارکسیزم لە ماتریالیستی و بوونی سروشتی و فۆرمالیستدا، زیادەڕۆیی کردووە، رەخنەی گرت، چونکە راستیی مرۆڤی زیندووی فەرامۆش کرد بوو، مارکس و ئینگلزو لینین ڕێڕەوی





دیالیکتیکییان بەسەر سروشتی بێ گیان و بەسەر مرۆڤی زیندووشدا بێ جیاوازی جێبەجێ کرد بوو، ئەمەش هەڵەیە چونکە دیالیکتیک لە لای ئەوان سروشتی بوو نەک مرۆڤایەتی، لە کاتێکدا وا پێویست بوو کە دیالیکتیک لە توێژینەوەی مرۆڤی پەرەسەندووی نەشونماکەر بەکار بێت لە بری سروشتی بێ گیان و چەق بەستوو، هەروەها زۆر لە مارکسیزمە هاوچەرخەکان پەڕگیر(متطرف)و زێدەڕۆ بوون لە گێڕانەوەی مێژوو و ڕووداوەکانی بۆ هێزی دوور لە مرۆڤ و خستنییە ژێر باری یاساگەلێکی هەربوو (حەتمی)ی توندەوە، بەڵام سارتەر وتی: مرۆڤ دروستکەری مێژووەو ڕووداوی مرۆڤایەتی بە پێی ئیرادەیەکی دەرەکی و یاساگەلێکی هەربوو ڕوو نادەن، بەڵکو لە هەستی خودانەی ناوەوەی مرۆڤ و پەیوەندییەکانی بە کەسانی ترەوە سەرچاوە هەڵدەبەستێت، بەم شێوەیە سارتەر دیالیکتیکی ماتریالانەی لاپەڕگری مارکسیزمی رەت کردەوە، هەوڵی دا بیکاتە دیالیکتیکێکی مرۆڤانەی زیندوو، ئەویش لە هەوڵیکیدا بۆ پەرەدان بە بوونایەتی بە دەوڵەمەند کردنی و دووبارە بەرزکردنەوەی بەرەو شوێنەکەی لە پێشەوەی دنیای هزردا، لە نێو دنیای ڕووداوەکان نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.

# بونیادگەری
# واتاو سروشتی بونیادگەری

تازەترین ڕێبازی فەلسەفەییە کەوا لەم سەردەمەی ئەوروپادا سەری هەڵداوە، مێژوونووسان بە ڕێبازی پاش سارتەرو بوونایەتیی ناو دەبەن، کە ئەگەر بوونایەتییەکەی سارتەر بارودۆخی کۆمەڵانی ئەوروپای ژێر باری دووەم شەڕی جیهان دەربڕێت، بونیادگەری فەلسەفەی کۆمەڵانی ئەوروپای ئێستا دەنوێنێ لە پاش ئەوەی ئاسەواری شەڕی لە خۆ داتەکاندو رووی بەرەو بنیاتنان نا. وشەی بونیادگەرییش لە رووی زمانەوە بە رەگەز پەیڤێکی لاتینییە واتای شێوە یا پێکهاتی هەمەکی (التكوين الكلي) کە کۆمەڵێک بەشی پێکەوە لکاو دەگرێتە خۆ، دەگەیەنێت، لە کوردیی خۆمانیشدا بونیادگەری لە پەیڤی بونیادەوە داتاشراوە، کە واتای دروست کردنەوە دەدات.

لە رووی واتاشەوە پەیڤەکە ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو شتێک لە بووندا بە گشتی و مرۆڤ بە تایبەتی بریتییە لە بونیادێکی تۆکمەو





پتەو، تێیدا کۆمەڵە بونیادێکی نیمچە هەندەکی هەن، پەیوەندیی دیاریکراویان لە نێواندا دەخولقێ و بونیادی شتەکە دەدات و ئەرکەکەی دیاری دەکات و جێ و ڕێی دەستنیشان دەکات لە مەیان بونیادەکانی دیکەی بووندا.

بەم پێودانگە گەر بایەخ بەرەو توێژینەوە لەو بونیادە هەندەکیانەی ناوەوەی هەر بونیادێکی تەواو تۆکمەی، بۆ نموونە چەشنی مرۆڤ چوو، ئەوسا دەتوانین ئەرکە راستەقینەکانی بزانین و پەیوەندییە ناوەکییەکانی، کە لە نێوان بونیادە هەندەکییەکاندا هەیە، ئاشکرا بکەین، جا دەتوانین بە راستییش راڤەی بکەین، هەروەها دەتوانین زاڵ بین بەسەر پارچە هەندەکییەکانی ئەم بونیادەو دووبارە ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی و گۆڕینی ئەرکەکانی.

لەشی مرۆڤ بریتییە لە بونیادێک، مرۆڤیش خۆی لە خۆیدا بونیادێکە، هەروەها کۆمەڵ و رۆشنبیری و شتانی دیکەش بریتین لە بونیادی تۆکمە، کە کۆمەڵێک بونیادی هەندەکی لە خۆیان دەگرن، بەو بونیادە هەندەکیانە پەیوەندیی دیارو ئەرکی دیاریکراویان لە نێوان دایە، بە لێتۆژینەوە دەستنیشان دەکرێن و دەتوانرێ بەرەو ئاستێکی چاکترو ئەرک بەجێ گەیاندنێکی چاکتر لە فەرماندا، ئاراستە بکرێن. ئەو شتانەی کە بونیادەکەی پێکدەهێنن خۆ بەخۆ چ بەهایەکیان نییە بەڵکو بەهاکەیان لەو پەیوەندییانە دایە، کە لە نێوانیاندا لە ئارادایەو بە جۆرێکی ڕێک کۆیان دەکاتەوە، لە سیستەمێکی دیاریکراودا گونجاوییان لە نێواندا دەرەخسێنێ و ئەرکی ئەو بونیادەش پیشان

دەدات.

بەم پێودانگە سەرەتاو کۆتایی بایەخدانی بونیادگەری (البنیویة) بە توێژینەوەی ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێو هەندەکییەکانی هەر بونیادەدا هەیەو بایەخ بە دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییانەی لە نێو بونیادە جۆر بە جۆرەکاندا لە ئارادایە، بەم واتایە بونیادگەری دەبێتە ڕێڕەوێکی پشکنین و توێژینەوە، زیاتر لەوەی کە ڕێبازێکی فەلسەفیی بێ گیان یا زانستێکی دیاریکراو و چەسپاو بێت، ڕێڕەوێکە لە پەیوەندییەکان دەکۆڵێتەوە نەک شتان، ئەویش بە ئامانجی تێگەیشتن لە ڕاستییان و پاشان زاڵ بوون بە سەریاندا و دوایی دووبارە ڕێکخستنەوەیان لە پێناو چاک کردن و بەرەو باڵا بردنیان.

## بارودۆخی سەرهەڵدانی بونیادگەری

گەلێ بارودۆخ بوونە هۆی دروست بوون و سەرهەڵدانی ئێستای بونیادگەری لە ئەوروپا، بەمەش بوونایەتیی خستە پشت خۆی لە هەوڵێکدا بۆ پلە بە پلە جێ گرتنەوەی ئەو و بەلانانی دەوری ئەو، یەکەم شتیش ئەوەیە کە کۆمەڵانی ئێستای ئەوروپای کۆتایی سەدەی بیستەم هەمان کۆمەڵان نین کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا دەژیان، یەکەم و دووەم شەڕی جیهانی، هۆ بوون بۆ وێران کردنی ئەوروپا، جا بوونایەتی سەری هەڵدا بۆ ئەوەی لە گرفتی ئازادیی مرۆڤ و پەیوەندیی ئەو گرفتە بە بەرپرسی و ڕاڕایی و سەرپێچیگەری و گەلێ چەمکی دیکەی فەلسەفییانەی بوونایەتی، کە لە ناخی ئەو شەڕانەوە





هەڵقوڵان. لەوانەشە هەر ئەمە هۆیەکانی خێرا بڵاوبوونەوەی بوونایەتی لە هەموو جێیەکی ئەوروپا هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە لە سەدەی بیستەمدا، راڤە بکات.

بەڵام ئێستا کە لە کۆتایی سەدەی بیستەم نزیک دەبینەوە بارودۆخی ئەوروپا بە تەواوی گۆڕاوە، دووبارە سەر لە نوێ لە کۆشش و بونیادنان و بیناکاری دایە، لە پاش ئەوەی ئاسەواری شەڕەکانی پێشوو رەش بووەوە، جا وردە وردە بوونایەتی- لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵانەی بۆ تازەکردنەوەی دەدرێت - وا خەریکە پاشەکشە دەکات بۆ ئەوەی رێی سەرهەڵدانی بونیادگەری بدات کە هاوجووتە لەگەڵ بارودۆخە تازەکەی کۆمەڵانی ئەوروپا لە بیناتنان و پەرەسەندن و باڵاچوون(الارتقاء)، لەبەر ئەوە بە راستی بونیادگەری رێبازی پاش سارتەرو بوونایەتییە.

دووەم بارودۆخێک کە بووە مایەی هاتنەکایەی ئێستای بونیادگەری لە ئەوروپا، شۆڕشی گەلانی ئەوروپا بوو بەسەر هەموو وشک هەڵاتنێکی رێبازی هزریانە، کە رێ لە بنیاتنان و پێشکەوتن بگرێت و، هەست کردن بە پێویست بوونی رێڕەوی هزریی نوێی کراوەی ناداخراو، کە نەرم ونیان بێت نەک رەق و وشک، بۆ ئەوەی یارمەتیی بنیاتنان بدات و لەگەڵ پێشکەوتندا بێت. هزرەوەرانی هاوچەرخی رۆژاوا بینییان کەوا بوونایەتی خەریکە دەبێتە رێبازێکی وشک، هەروەها مارکسیزمیش لە روانگەی ئەوانەوە بووە رێبازێکی داخراو، لەبەر ئەوە کارەکە پێویستی بە بیرێکی نوێی کراوە کرد،

زیاتر لە مێژووەوە نزیک بێت نەک ڕێباز، ئەمەش لە بونیادگەریدا وەدەر کەوت، کە نکوولّی لەوەش ناکرێت سوودێکی زۆری لە بوونایەتی و مارکسیزم وەرگرتووە، بەڵام لە پێکهاتنێکی نوێ و ڕێڕەوێکی جوداو گونجاو لەگەڵ بارودۆخی ئێستای کۆمەڵانی ئەورووپا.

لە دواییدا سێیەم بارودۆخێک کە بووە مایەی ئێستا سەرهەڵدانی بونیادگەری ئەو کۆششە بوو، لە پێناو پەرەپێدان بە زانستە مرۆڤایەتییەکان، بۆ ئەوەی بگەنە باری پێشکەوتووی زانستە سروشتییەکان، بەڵێ پێشتر هەوڵانێک هەبوو، (هۆسرڵ) لە ڕێی فینۆمینۆلۆژیاوەو سارتەرو بوونخوازەکانی دیش، بێ لە مارکسیزمەکان و غەیری ئەوانیش، بەڵام ئەم هەوڵانە نەگەیشتنە ئەو ئامانجانەی کە مەبەست بوون، چونکە زۆربەیان لە رووتاڵەکی (تجرید)دا قووڵ بوونەوەو، بایەخ بە خودێتی مرۆڤ درا نەک بەو پەیوەندییە بابەتیانەی مرۆڤ بە کەسانی دیکە دەبەستێتەوە. لێرەدا بونیادگەری سەری هەڵداو تێکۆشا لەو هەوڵانەی پێشوو وەدوور کەوێت، بە ئامانجی پەرەپێدانی زانستە مرۆڤایەتییەکان بە گشتی و توێژینەوە لە مرۆڤ وەکو چۆن لە جۆرەها پەیوەندییە بابەتیەکانیدا بۆمان دەنوێ، هەڵبەت بونیادگەری لە گەوهەردا بریتییە لە شیکردنەوەی پێکهاتەو بینای مرۆڤانەو دۆزینەوەی پەیوەندییە بابەتییەکانی نێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی، لە پێناو زاڵ بوون بەسەریان داو بەرەو بالآیی بردنی بۆ ئەوەی مرۆڤ بگاتە ئەو کاروانی پێشکەوتنەی کە زانستە سروشتییەکان پێی گەیشتوون.



## ناودارترین زانایانی بونیادگەری

ژمارەیەک هزرەوەرو مرۆڤناس لە دامەزراندنی بونیادگەریدا بەشدار بوون ئەویش بە واتاکەی پێشووی، هەوڵیان دا لە شێوەیەکی روون و تۆکمەدا پیشانی بدەن، بە هۆی ژمارەیەکی زۆر لە دانراوو توێژینەوە کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابوورییەکانیان، وەکو دەشبینین زۆربەیان فەرەنسین و لە بواری ئەنترۆپۆلۆژیا (مرۆڤناسی) واتە زانستی توێژینەوە لە مرۆڤ و شارستانیەتی کۆن و کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا، کاریان کردووە، هزرەوەرانی بونیادگەری بایەخیان بە توێژینەوەی هەموو شتێکی پەیوەندار بە دیاردە مرۆڤایەتییەکان داوە چەشنی زمان و نەریت و ئەفسانەو وێژەو هی دیکە، ئەویش لە هەوڵەکەیاندا بۆ دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییەی کە پێکیانەوە گرێ دەدات. هەروەها دەبینین کەوا زانایانی بونیادگەری بەتەواوی بوونایەتی و مارکسیزم و ڕێبازە هاوچەرخەکانی دیکەیان ڕەت نەکردۆتەوە، بەڵکو سەرنجێکی تازەی ڕەخنەگرانەیان لێدان و هەوڵی تێگەیشتنیان دان لە مەیان تێڕوانینی بونیادگەرانەی خۆیاندا.

لە نێو بونیادگەرە فەرەنسییە هاوچەرخەکان (لویس ئەلتووسێر)(*) دەبینین کە لە ڕاستیدا مارکسی مەشرەبە، بەڵام بە فەلسەفەی مارکسیزم و ڕێڕەوە دیالیکتیکییەکەیدا چۆوە بەو ئامانجەی پەرەی پێبدات بۆ ئەوەی کرداریانە بەشدار بێت لە پێشکەوتنی مرۆڤ و،

(*) لویس ئەلتووسێر (التوسیر - Althusser/ ١٩١٨-١٩٩٠) فەیلەسووفێکی فەرەنسییە، ڕێبازی (ئامێری ئایدیۆلۆژییەکانی دەوڵەت)ی داناوە.





کۆمەڵ بەرەو بالاچوون بەرێت، ناودارترین نووسراوی کتێبی (خوێندنەوەی سەرمایە)یە کە بە هاوبەشیی دوو مارکسیزمی فەرەنسی داییناوە. لەو کتێبەدا هەوڵیدا کە بیروڕاکانی مارکس لە نێو کتێبی (سەرمایە)دا فراوانتر بکات و لە چێوەی بوارکانی ئابووری یا وشکی رامیاریی تێپەڕێنێت و گەلێ بابەتی زمانەوانی و مێژوویی و فەلسەفیی دایە پاڵ، بۆ ئەوەی مارکسیزم بە تەنها لە توێژینەوەی بونیادە ئابوورییەکەیدا نەمێنێتەوە، بەڵکو لە سنووری ئەو دەربچێت و لە بونیادەکانی دیکەی مرۆڤ و کۆمەڵ بە تێکرا بکۆڵێتەوە.

هەروەها لە زانایانی ئەم ڕێڕەوی بونیادگەرە دەبینین (جاک لاکان) هەمان تێڕوانینی ڕەخنەگرانەی پێشووی بەکارهێنا، (سیگمۆند فرۆید)یش هەوڵیدا بونیادە ناوەکییەکانی مرۆڤ بناسێ و ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێوانیاندا هەیە یەکالایان بکاتەوە، (جاک لاکان)(*) لە مەیان هەوڵەکانی (فرۆید) لە ڕێی ئەو مەبەستەدا کتێبێکی گەورەی بە ناونیشانی (کاری هەڵبژاردە لە فرۆیدەوە) دانا، تێیدا کەوتە شوێن پەرەسەندنە مێژووییەکەی بیروڕاکانی فرۆیدو هەوڵەکانی بۆ دۆزینەوەی گۆشە تاریکەکانی دەروونی مرۆڤ و لێکدانی ئەو بونیادە هەندەکییە تایبەتانەی بە ئەو، لەگەڵ دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان نەخۆشییە دەروونییەکان و ژیانی کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و بونیادی دیکەی مرۆڤانەی چەشنی لەش و ئاوەزو سێکس

(*) جاک لاکان (لاکان – Lacan/ ١٩٠١-١٩٨١) پزیشکێکی فەرەنسییەو دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی گرنگی شیکاری دەروونییە.





... تاد.

لە نێو بونیادگەرەکاندا کۆمەڵێکی دیکەی پشکنەر پەیدا بوون کە بوونە پسپۆڕ لە توێژینەوەی هەندێ بونیادی هەندەکی و بە فراوانی لە هەندێ دیاردەی مرۆڤانەیان کۆڵییەوە بۆ دۆزینەوەی هەندەکییەکان (الجزئیات) و پەیوەندییە ناوەکییەکانی (العلاقات الداخلیة)، لەوانە بۆ نموونە (میشێل فۆکۆ)(*) کە بووە پسپۆڕی توێژینەوەکانی زمان لە رووی بنەڕەت و پێکهات و ئەرکەکەیەوە، هەروەها (رولان بارت) خاوەن توێژینەوە جۆراوجۆرەکانی دەربارەی مۆدەو جل و بەرگ و پەیوەندییان بە کۆمەڵ و رۆشنبیری و دابەکانەوە، هەروەها (موریس جودلێ) کە بە گشتی رووی بایەخی کردە توخمی مرۆڤانە وەکو بونیادێکی تۆکمە، دواتر بە تایبەت بایەخی بە بنەچەکان دا لە رووی پەرەسەندنی مێژوویی و کۆمەلایەتییەوە، بۆ دۆزینەوەی هەموو ئەو پەیوەندییانەی تایبەت بە ئەون، لە دواییدا زانایەکی ئەنترۆپۆلۆژیامان دێتە بەر نیگا، کە ئێستا بە ناودارترین دامەزرێنەری بونیادگەری دادەنرێت، (کلۆد لیڤی شتراوس)(**) کە ناوبانگی بەسەر ناودارییی زانا بونیادگەرەکانی دیکەدا زاڵ بووە، ئەویش لەبەر توێژینەوە جۆر بە جۆرەکانی لەم بوارە نوێیەی مرۆڤایەتیدا.

(*) میشێل فۆگۆ (فوکو – Foucault/ ١٩٢٦-١٩٨٤) فەیلەسووفێکی فەرەنسییە.

(**) کلۆد لیڤی شتراوس (لیڤی شتراوس – Levi - Strauss/ ١٩٠٨-؟) یەکێ لە زانا فەرەنسییە بەناوبانگەکانی رەگەزناسیی مرۆڤە، لە پێشەنگەکانی بونیادگەرییە لە بواری راڤەکردنی رەگەزەکانی مرۆڤایەتی و لێکدانەوەی ئەفسانەکان.

(ک .ل. شتراوس)ی زانا فەرەنسییەو لە ئەنترۆپۆلۆژیادا پسپۆڕەو ناودارترین زانای ئەفسانەناسی هاوچەرخەو لە هەموو بونیادگەرەکان زۆر بەرهەمترە، زۆر توێژینەوەی پوخت و قوولی هەیە وەکو (کۆمەڵگا سەرەتاییەکان)، (تەوتەمیزم لە ئەمڕۆدا)، (ئاوەزی سەرەتایی)، (بونیادە گەوهەرییەکان لە خزمایەتی و رەچەڵەکدا)، (جیهانێک لە رێی پاکۆداندا)، (ئەفسانەکان)و (خاو و لێندراو) لەپاڵ گەلێ وتارو کتێبی دیکە.

## پوختەی بیروڕا بونیادگەرییەکانی شتراوس

شتراوس لە مەیان تۆژینەوەی ئاوەزی سەرەتایی (العقل البدائي) بە تایبەتی و ئاوەزی مرۆڤانە (العقل البشري) بە گشتی، ویستی ئەوە دووپات بکاتەوە کە ئاوەز هەیەو وەکو بابەتێکی سروشتی بناغەیەکی هاوبەش و گشتیی هەیە لە نێو هەموو توخمەکانی مرۆڤایەتی. بەمە روانینە باوەکەی دەربارەی ئاوەزی مرۆڤانە، هەڵوەشاندەوە کە دەڵێ: لە چاخێکەوە بۆ چاخێکی دی و لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دی، ئاوەزی مرۆڤانە جیاوازیی تێدایە، تەرزەکانی ئاکارو بیر لەوانەیە گشتی بێت لە نێو هەموو مرۆڤایەتیدا، ئەویش لە بناغە گەوهەرییەکەیدا نەک لە فۆرمە بەشکییە گۆڕاوەکەی (المفردة الجزئية المتغيرة)دا، جا ئەو تەرزە ئاکارو شێوازە بیرکردنەوانە چ لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا بوو یا لە کۆمەڵگای ژیارداردا بوو، مرۆڤی سەرەتایی لە ناوەڕاستی ئەفەریقاو



شوێنە سەرەتاییەکانی دیکەدا، هەمان ئاکارو بیرکردنەوەی مرۆڤی ژیارداری ئەوروپاو ئەمەریکای هەیە، ئەویش لەسەر بنچینەی هاودژە دووانەکان هاودژە جووتەکانی نێو هەموو کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکاندا، کە بنچینەکەی پۆزەتیڤی و نەگەتیڤییە، بۆ نموونە مرۆڤایەتی و ئاژەڵایەتی، سروشت و رۆشنبیری، لێندراو و خاو، هەروەها گەلێ شتی دیکەی لەم چەشنە، کە لە ئاوەزی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤایەتیدا گەوهەرین. بەم شێوەیە لە رێی توێژینەوەی جودا جوداوە دەتوانین زۆر تەرزە ئاکارو بیرکردنەوەی چون یەک و هاوبەش لە ئاوەزی مرۆڤایەتیدا بدۆزینەوە.

شتراوس ئەمە دووپات دەکاتەوە کە هۆیەکانی چوونەوەی مرۆڤی ژیاردار بەرەو سروشت بە هەموو ئەو جوانی و ساکارییەی کە تێیدایە، ئەوەی پێشتر ئاماژەی بۆ کرد، راڤە دەکات، هەروەها پاکانە لە مەیلی مرۆڤی شارستانیەتی سەدەی بیستەم بۆ گەڕانەوە بەرەو جۆری ژیان لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا، راڤە دەکات، شارستانیەتی هاوچەرخ هەموو توانا ئاوەزییەکانی لە دەست داوە، هەموو گونجاوییەکیشی لە نێو کەساندا دیسان لە دەست داوە، ئەویش بە پێچەوانەی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان کە تا ئێستا لە ئاکاردا لەسەر رێچکەی ئاوەزی ساکار دەڕوات، کە کەسانی لە یەکەیەکی هەمەکیی سەراپاگیر (وحدة كلية شاملة)دا هاوگونجاو دەبن، کە لە ئەمڕۆی ژیانی ئاڵۆزی شارستانیەتی هاوچەرخی رۆژاوا ئەم شتە لەدەست چووە.

هەروەها شتراوس بایەخی بە توێژینەوەی ئەفسانەو شیکردنەوەی





ئەفسانە دەدا، بۆ ئەوەی هەموو سیستەمە کۆمەڵایەتییە سەرەتاییەکانی تایبەت بە ئەوی لێ هەڵبهێنجێ و، بە شوێن کۆچ کردنی ئەو ئەفسانانەو راگوێز بوونیان لە نێو کۆمەڵگا جۆربەجۆرەکاندا بڕوات، دیتی کەوا لە ناواخندا سیفاتە گشتییەکانی ئاوەزی مرۆڤانەو تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی نێو کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکانی تێدایە، هەروەها گەیشتە ئەوەی کە ئەو ئەفسانانە وزەی جوولێنەری ئاوەزی مرۆڤانە دەنوێنن و لە کێویەتی(التوحش) یەوە بەرەو ژیارداری (التمدن)ی برد، هەروەها لە زاڵبوونی سۆزەوە بەرەو زانینی ئاوەزی و لە سروشتی ساکارەوە بەرەو رۆشنبیریی ئاڵۆز، بەم شێوەیە ئەفسانەکان دەتوانن راستیی پەرەسەندنی مرۆڤ لە مەیان (هاودژە دووانەکان) (الاضداد الثنائیة)ەوە راڤە بکات بە هۆی دۆزینەوەی پەیوەندییەکانی کە پێکیانەوە دەبەستێتەوە.

شتراوس بۆ ئەم شتەی سەرەوە لە کتێبی (خاو و لێندراو)دا نموونەیەک دێنێتەوە، تێیدا - لە مەیان شیکردنەوەی ئەفسانان و ئەو پەیوەندییانەی لە نێوانیاندا هەیە - دەگاتە ئەوەی کە کرداری لێنان توانای مرۆڤ پیشان دەدات لە گۆڕینی خۆراک لە حاڵەتی خاوی سروشتییەوە بۆ حاڵەتی لێندراوی دەستکرد، واتا گۆڕینی شتی ناشی سروشتی بۆ شتێکی دەستکردی مرۆڤانە.

لێرەوە شتراوس لەسەر ئەوە سوورە کە کرداری چێشت لێنان هەموو کەیبانوویەک ئەنجامی دەدات، کەلەپوورێکی گەورەی مرۆڤایەتی و ئەفسانانی لە پشتە، کە لە لایەک پەیوەندیی نێوان سروشت و مرۆڤ





روون دەکاتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و کەسانی دیکە روون دەکاتەوە، جا ئەرکی بونیادگەری لەوەدایە، کە پەیوەندییە ناوەکییەکانی و بونیادە بەشکییەکانی، کە لە نێو خۆیاندا یەکتر تەواو دەکەن بۆ ئەوەی فۆرمی یەک بونیاد وەربگرێت، لە کرداری چێشت لێناندا بەدیار دەکەوێت، بدۆزێتەوە، ئەو بونیادەش بۆ تۆکمە بوون یەکانگیر دەبێت لەگەڵ بونیادی زەمان و بونیادی دابەکان و بونیادەکانی دیکەی مرۆڤانەدا.

شتراوس لە نووسین و توێژینەوەکانیدا خۆی لە قەرەی دیاردەگەلێکی گرنگی دیکەی مرۆڤانە دەدات، ئەویش خزمایەتی و تێکەڵی و ژن خوازییە، بە شوێن بونیادە جۆراوجۆرەکاندا دەڕوات، کە لە نێو خۆیاندا تۆکمە دەبن بۆ ئەوەی قەوارەی روونی دیاردەکە دەربخەن، لەم لێ توێژینەوەیەشیدا دەگەڕێتەوە سەر کۆمەڵگا سەرەتاییەکان و ئەفسانە کۆنەکان، بە شوێن پەرەسەندنەکانیاندا دەڕوات و پەرە بە پەیوەندییەکانی نێوانیشیان دەدات لە گێتی و هەموو کیشوەرەکاندا، لە نێو جۆرەها کۆمەڵگاکانی کۆن و نوێدا، لە کۆتاییشدا ئەو ئاکامەی چنییەوە، کە ئافرەت کاتێک شوو بە پیاو دەکات وەکو ئەوەی کە پەیامی خۆی لە نێو گرووپی پیاواندا بەجێ گەیاند بێت ، پاشان شووکردن و ژن هێنانی رۆڵەکانی لەمەو پاشتر کە گەورە دەبن، درێژەدان بە گەیاندنی ئەو پەیامە دەگەیەنێت.

شتراوس تێبینیی ئەوەی کرد کەوا ئافرەت لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا دەبنە ئەو دیارییانەی پیاوان پێشکەش بە یەکدی

دەکەن،، هەروەکو دراو و بەروبووم و شتی بەهادار کە پیاوان لە نێوان
یەکدا دەیانگۆڕنەوە، بەڵام کۆمەڵگەی نوێ ئەم شێوە دەرەکییەی ژن
هێنانی پیاوانی وەلا ناوەو لەوە بالاتر بووە، کە ژن هێنانی تەنها
دیارییەک بێت، بەڵام ئەم راستییە هەروەکو خۆی ماوەتەوە لە نێو
کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا. شتراوس جۆری ژن خوازی و حەرام
کراوەکانی لە جۆرەها کۆمەڵگەدا بەسەر کردەوە، بەوەی هۆی حەرام
کردنی ژن خوازی لە هەندێ خزمدا بۆ پێویستیی کۆمەڵ بە فراوان
کردنی تێکەڵی دەگێڕێتەوە، هەروەها بۆ فراوان کردنی بازنەی دیاری
گۆڕینەوەو نامە هەڵگرتن لە نێو کۆمەڵی پیاوان و لەسەر گەورەترین
ئاستی بەرتوانا.

ئێستاش لە پاش ئەوەی بە کورتی هەندێ توێژینەوەی شتراوس
دەربارەی بونیادە جۆر بەجۆرەکانی مرۆڤایەتی لە کۆن و نوێمان بەسەر
کردەوە، دەمانەوێ بە کورتی سیمای رێڕەوی بونیادگەری و گرنگترین
تایبەتمەندییەکانی هەروەکو لە لای شتراوس و غەیری ئەو لە
بونیادگەرانی، دیکەدا دەنوێ، دیاری بکەین.

بونیادگەری لە گەوهەردا میتۆدە لە پێش ئەوەی رێباز بێت، واتا
(مەنهەجە) نەک (مەزهەب)، هەوڵێکی والایە بۆ دۆزینەوەی راستیی
مرۆڤانەو رێبازێکی وشک و داخراو نییە. میتۆدێکی شیکاری و
لێکدانکارییە بۆ بونیادە مرۆڤایەتییەکان بە هەموو پێکهاتە
بەشکییەکانەوە، ئامانجی ئەم میتۆدە دۆزینەوەی پەیوەندییە
ناوەکییەکانە کە پێکهاتەکانی هەموو بونیادێک پێکەوە





دەبەستێتەوە، وەکو رێ خۆش کردنێک بۆ زاڵبوون بە سەریانداو
دووبارە رێکخستنیان و بەرەو بالا بردنی ئاستی کارکردنیان.

تەوژمە رووتاڵەکییە هاوچەرخەکان چ لە زانستەکانی سروشت
یاخود زانستەکانی مرۆڤدا، هەروەها زۆربەی رێبازە فەلسەفییە
رووتاڵییەکانی ئێستا، لە توێژینەوەی بەشکییە (جزئیات) جۆر بە
جۆرەکانی هەر دیاردەیە بە جودا لە دیاردەکانی دیکە، زۆر قوول
بوونەوە، هەروەها فۆرمی هەمەکی و پەیوەندییە گشتییەکانی نێوان
جۆرەها دیاردەکانی بوونیان فەرامۆش کرد، لەبەر ئەوەی لە دەرک
کردن بە راستەقینە کورتیان هێنا، هەروەها تەوژمی دیکە لە هەندێ
زانستی مرۆڤانەدا سەریان هەڵدا، کە بایەخیان بە فۆرمی هەمەکی
(الشکل الکلي) و پەیوەندییە گشتییەکان دەدا زیاتر لە بایەخدان بە
پێکهاتە بەشکییەکان، هەروەها کۆمەڵێک رێبازی ئایدیالیستی و
رەها لە فەلسەفەی هاوچەرخدا بایەخی تەنها لە چێوەی ئەو
(هەمەکە)دا دەرنەکردو لە پێشەوەی تەواوی بایەخەکانی خۆی دانا،
ئەویش لە جیاتی بایەخدان بەو بەشکیانەی کە پێکی دەهێنن و
ئەمانەیان خستە پاشەوە، لەبەر ئەوە دەرک کردن بە راستەقینە کورتی
هێنا، چونکە راستەقینە لە گەوهەردا بریتییە لە پێکگەیشتنی
پێکهاتە بەشکییەکان لەگەڵ فۆرمی هەمەکی لە یەکەیەکی پێکەوە
لکاو بە هۆی پەیوەندیی دیاریکراوەوە کە چ سەرپشکییەکی تێدا نییە
بۆ لایەنێکیان بەسەر ئەوەی دیکەدا .

لەم روانگەیەوە بونیادگەری کەوتە دیاری کردنی ئەرک و

ئامانجەکانی خۆی و هەوڵیدا بەشکی و هەمەکییەکەی کە دەیانگرێتە خۆی، لەسەر پەیوەندیی نەگۆڕ لە یەک بونیادی تۆکمەدا کۆیان بکاتەوە، هەموو بونیادێکیش بە ڕۆڵی خۆی لەگەڵ بونیادەکانی دیکەی بووندا، تەواوکاری پێک دەهێنێت، ڕەگەزە بەشکییەکانی هەر بونیادە خۆیان لە خۆیاندا بە تەنهایی چ واتایەکیان نییە، بەڵکو ڕاستەقینەیی و واتاکەی ئەو کاتە ئاشکرا دەبێت، کە بە ڕەگەزی بەشکیی دیکەوە پەیوەندیی ڕێککاری (تەنزیمی) دیاری کراوو نەگۆڕ دەخولقێنێ. لێرەوە دەبینین کە پێشدەستی لە بونیادگەریدا بۆ پەیوەندییەکانە نەک شتان، چونکە هەر ئەو پەیوەندییانە فەرمانی شتان دیاری دەکەن و واتای جۆراوجۆری بە سەردا دەدەن، هەر ئەویشە کە بونیادی تۆکمە دەداتە هەموو شتێک، ئەو بونیادەش بەش بەحاڵی خۆی دەلکێ بە بونیادەکانی دیکەوە لە ڕێی پەیوەندیی فراوانترەوە.

هەموو بونیادێکی نێو بوونەوەر چەشنی زمان و کۆمەڵگاو مرۆڤ و هی دیکە بریتییە لە پەیوەندیگەلێک کە بەشەکیانێکی جۆر بەجۆر (جزئیات مختلفة) کۆ دەکاتەوە، سروشت و فەرمان و ئەرکە مێژوویی یا کۆمەڵایەتییەکەی دیاری دەکات، جا دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییانە واتای زاڵبوون بەسەر خودی بونیادەکە دەگەیەنێت و دووبارە ڕێکخستنی ئەو پەیوەندیانەی لە نێوان بەشەکییەکانی دایە، بەرەو بالآبردنی فەرمان گەیاندنەکەی، بەم شێوەیە پێشکەوتن بە تایبەتی بە نیسبەت بونیادی مرۆڤانەوە، دێتەدی.

هەر بەم شێوەیە بونیادگەری دەبێتە میتۆ (ڕێڕەو)ێکی کراوە،





توێژینەوە لە پەیوەندیی هەڵچنراوی نێوان بەشەکانی هەر بونیادێکی مرۆڤایەتیدا دەکات، ئەم ڕێڕەوە پشت بە هەندێ ڕێسای بنچینەیی دەبەستێت، کە دەتوانین لە باسەکەی پێشوومانەوە هەڵیان بهێنجین.

**یەکەم:** شیکردنەوەی هەموو بونیادێک بۆ ئەو بەشەکیانەی کە پێکی دەهێنن، بۆ دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییە تایبەتیانەی کە پێکیان دەبەستێتەوە، دواتر دووبارە لێکدانی لە بونیادێکی نوێی هەمەکیدا کە لە بونیادەکەی پێشین بالآترو پێشکەوتووتر بێت.

**دووەم:** دیاری کردنی سەمتی هەر کرداریێکی شیکاری و لێکدانکاریی هەموو بونیادێک، ئەویش لە سیفەتی مرۆڤانەدا دەنوێ کە دەبێ ببێتە بنچینە لە توێژینەوەی هەر بونیادێکدا، هەرچەند کە زەن وا ببرێت کە لە مرۆڤەوە دوورە، چونکە بونیادگەری لە گەوهەردا خۆمەیل (نزعە)ێکی مرۆڤانەیە، مەبەستی پەرەدانە بە بونیادە جۆر بە جۆرەکانی مرۆڤایەتی و بەرەو بالآبردنی پەیوەندییە فەرمانییەکانی کە بەشەکییەکانی پێکەوە گرێ دەدات.

**سێیەم:** دۆزینەوەی بنەما شاراوەکانی پشت هەر بونیادە، ئەو بنەمایەی کە لە پەیوەندییە بابەتییەکاندا دەنوێ، هەروەها بنەمای ڕوونی ئاوەزی نین، بەڵکو هەر ئەو پەیوەندییانەیە نەک شتێکی دیکەی لەوان بالآتر.

بونیادگەران لە مەیانی ئەم ڕێڕەوەوە، لە زۆر بونیادی جۆراوجۆری مرۆڤانەی چەشنی زمان و دابەکان و ئەفسانان و شتی دیکەیان

کۆڵییەوە بۆ ئاشکرا کردنی راستیی ئەو پەیوەندییانەی لە نێوانیان دایە، بۆ ئەوەی بنەمای مرۆڤ بدۆزنەوەو فەرمان بەجێ گەیاندنی مرۆڤیش لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەرەو بالآچوون بەرن.







## کتێبە چاپکراوەکانی دەزگا





